# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمارە ( ٤ ) ، خولی دووەم ، ئـابی ١٩٨٠

لقی یەکێتی لە سلێمانی بابەتەکانی ئەم ژمارەیەی ئامادە ک...
ئەرکی لەچاپدانی گرتوەتە ئەسـتۆ

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

مومتاز حەیدەری

بـارەگای گۆڤـار

بغـداد ـ الوزيريـة
مقابل كلية التربية الرياضية ، مقر جمعية الثقافة

چاپخانەی "الحوادث"

بەغـدا ـ ١٩٨٠

# « الكاتـب الكـردي »

## مجلة « نووسەری کورد »

## مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العدد ( ٤ ) ، الدورة الثـانية ، آب ١٩٨٠



الادارة

بغـداد ـ الوزيريـة
مقـابل كلية التربية الريـاضية
مقر جمعيـة الثقـافة الكرديـة

# THE KURDISH WR

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITE

No. (4) , Second Period, August 1



Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSIT
OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUA
THE KURDISH CULTURAL SOCIETY .

کورتــه چــیرۆك

# لەودیو دەرگا ئاسنینەکەوە

« شێرزاد حەسەن »

**[ سەرەتای مێژووی هەموو مرۆڤایەتی بە برسێتیو خۆشەویستی دەستی پێ کردووە . ] ( بووزا )**

هەندێ ئێواران .. هەست بە خۆشییەکی بێ سنوور دەکـەی .. وەکو خۆشی زەوی وشکی بەرباران .. خۆشی یەکەم باڵەفڕەی بێچـوە چۆلەکەیەك .. پەپوولە ئاسایی شنە بایەك فڕینت خۆشتر دەکا .. سووکتر دەبی .. دەترسی وەکو توێژاڵێکی تەنك بەیەکجاری لە توێـکڵی زەوی ببیتەوە ، یان ببی بە باڵندەیەك بە ئاسماندا بەرز بفڕی .. بـۆ هەتا هەتایە ببیت بە هێمای ئەو خۆشی‌یە کتو پڕو ناوەختە .. بۆیە هەوێنی خەمێك دەگریتەوە . کارەساتە مەزنەکان دەخەیتەوە یـادی خـۆت : هەنـدێ یادگاری تفتو تاڵی مناڵیت . ڕووی باوکە توندو تووشەکەت .. هەندێ لەو پرسانەی دڵتیان کۆڵیوە .. ئەو شەڕو برسێتی‌و لافـاوانەی لەسـەر لاپەڕەکانی مێژوو خوێندووتەتەوە .. زۆر بەخۆشی ئاشنا نیت .. ئـەم خۆشی‌یە کورتو کەم خایەنەش دەتترسێنێ . لەم ساتەدا دەتوانی ببیت بە فریشتە یان ئەهریمەن..خۆت وای..هێزی جادووگەرێك داتدەگرێ.. ئیمڕۆ ئێوارە لەگەڵ ئەو هەموو هێمنی‌یەی سەر ڕوخسارت ، دەریایەکی تۆڵە لە ناختا شڵپو هووڕیەتی .. بۆیە هەوڵ دەدەی بەناو ناخی خۆتدا

شۆڕ ببێتەوە •• ماسی یە وردەکانی شادیت دەخرێنە قوولایی دەریایەکەوە •• نەوەك لەگەڵ شەپۆلە شێتەکانیا بکەونە سەر لمی قەراغ••
پێویستە لەم ساتانەدا شتەکان تێکەڵو پێکەڵ نەبن •
ئێستاش وا خۆر ماڵئاوایی لە خەڵكو شەتامو خانووەکان دەکا •
هەروو شتێ د لێی کەوتۆتە ژێر نارایەکی تەنكو ئاڵ •• لای تۆش دەمو چاوە جوانو ناشیرینەکان •• ئەو ڕووانەی زەردەخەنەیان خەم دەبارێنێ •• مەزنو فریشتانە خۆیان دەگۆڕن •• دنیا وەکو کچێکی خەوتووی بەر مانگە شەوی لێ دێ •• کە بە ئاسانی ماچ بکرێ ! •
ئێمرۆ ئێوارە هەمان خۆشی دای گرتووی •• هۆی ئەم خۆشی یە کتوپڕەشت نازانی •• بەلام ئەوەت لەیادە ئێمرۆ ئێوارە بەڕێوەیت •• دەچیتە دیدەنی ژنێك •• خۆشت دەویست •• گوایە ئەویش خۆشی دەویستی •• بەلام داخ کە جارجارە بە منالی دەزانیت •• کەچی تۆ هیچ نیشانەی گوانێکت لە خۆتدا نەدەبینی •• سمێڵێکی لاکێشی قنجت بەردابۆوە ••
دەنگت تا دەهات کەرخو نێرانەتر دەبوو ، قوڕقوڕاگەت خر وەکو ۆیکی بچوك •• لە کاتی تف قووتدانو ئاو خواردنەوەدا •• بەرزو نزم دەبوەوە •• خوێنێکی گەرمتر لە دەمارەکانتا کەفی دەکرد •• شەوانیش خەونەکانت پڕدەبوون لە ئافرەتە قەرەجەکان ••• چیرۆکێکی زۆری دەردی دڵو دڵداریت دەزانی •• هەستت دەکرد دەتوانی دڵی کچێکی کاڵی بێ ڕابگری •• بەلام •• ئەم ژنەی ئێمرۆ ئێوارە دەچیتە دیدەنی •• توانی بتخاتە ژێر شاخی خەمێکی مەزن •• یاری بە هەستو نەستو خەونو خەیالاتت کرد •• ڕابوردوو داهاتووت •• بوونت ، بەس ڕۆژگار دێو دەڕوا •• ئێمرۆ ئێوارەش لەوە دەچێ •• هەموو شتێ لە بەرژەوەندی تۆدا بێ •• بێ گومان !

ئێوه •• گەنجیماڵە هەژارەکان •• کاێ لەپشت دەرگا گەورەکانەوە دەوەستن ••• زۆر دەترسن •• لە ژوورە پانو پۆڕەکان •• ژوورێ پڕ بۆنو بۆیەو ڕەنگ •• پەردەی گوڵ گوڵی •• باخچەو چیمەنێکی تێروتەڕ •• کورسی •• گوڵدان •• مووبەقە چەور ••

تابلۆی قەشەنگ •• سیسەمی نەرمی دووکەسی •• بانیۆ •• تارمەی فێنکی بەر زەردە پەڕی ئێوارە •• زۆر شت •• شتی زۆر •• هەرشتێ لە ماڵەکانیان چیرۆکی هەواو فیزو ئەتەکێتیان دەگێڕێتەوە •• تاقو پەنجەرەو کونو کەلەبەر نامێنێ پڕ نەبێتەوە •• پشیلەو سەگەکانیشیان ناوو ناسنامە هەڵدەگرن •• وەك هەر لاوێکی گەڕەکە تاریكو کۆنەکان•• (تۆ)یەك پەروەردەی ماڵێك •• لە برسێتیو گریانو جنێو زیاتر نازانی •• تۆیەك هەڵگری ساڵانێکی پڕ برینی مناڵیت •• وێنەی تەڵخی چەند کچێك •• لە ڕێگاوە جێیان هێشتی •• پێش ئەوەی بگەنە هەورازێکی سەخت •• تا لەمکاتەدا •• کە توانیت بگەیتە بەردەرگای کۆشکی ئەو کۆنە خۆشەویستەت •• مێشکت بووە مەیدانی شەڕەکەی • • تەڕوادە ـ ! وتت •• بەگوێرەی ئەم ئەدرەسو ناونیشانەی خۆیەتی • لەگەڵ ئەو هەموو ترسەش •• ئەو ترسەی لێت دەنیشێ •• کە لەپشت هەر دەرگایەکی ئاسنینی گەورەی سێ پەردەیی دەوەستێ •• خۆشی یە مەزنەکە بەری نەدابووی • پەنجەی شایەتمانت بەسەر زەنگەکەوە بوو •• داتەگرت لە سیحری ئەو خۆشی یەی هەستت دەکرد بە هێزتری•• بالاتری •• مت وەستابووی •• بیرت لەوە دەکردەوە : « بێگومان •• ئەم دیدەنیەم •• خەمناك •• پڕهێز •• چاوەڕوان نەکراو •• هەرچۆنێ بێ •• دوورە لەوەی ئاسایی بێ •• کتوپڕو سەیر لای ئەو دەکەوێتەوە •• کۆلان نەبوایە •• سووڕم دەخوارد ، پاش ئەوەندە ساڵە •• زۆر شت گۆڕاوە •• دەشێ من هەست بە خۆم نەکەم •• ئەو

زیاتر هەستی پێ‌دەکا •• کاتی خۆی پێم‌دەوت : ئاوینەمی تۆ ! ، پێدەکەنی‌و دەتریقاوە •• بەدەم تریقەوە سەرو قژە ڕەشەکەی بەدوادا دەکەوت •• زەردی بەدەردەکەوت ، زیاتر دەیشێواندم دەیوت : بترسە نەوەك ڕۆژێك ژەنگ بمگرێ !

ئیتر هەر بگەمە ژوورەکەی •• دەست‌دەکا بە پرسین‌و تێبینی‌یە ووردەکانی خۆی •• ئەو تێبینی‌یانەی ساڵانی هەرزەکاریم دەیکوشتم • ئیستا ئەوسا نی‌یە ، جیاوازە •• پاش ئەوەندە ساڵە ڕەشەبایەکی زۆرترو شێت‌تر لوولیان داوم•• بارانێکی ئەستوورتر بەسەرما باریوە•• ئەویش نابێ وەکو جاران مابێتەوە ، زیرەکتر بووە ، دەتوانێ باشتر بخوێنێتەوە، چەك‌و کەرەستەیەکی زۆرترم بەدەست هێناوە •• چەند شەڕێکی کوشندەترم بینیوە ، لە چاوی کچی قەیرەو کچ‌و ژن‌و بێوەژن‌و پیرەژنی گێل‌و گەمژەلی ئەم چەرخە •• شتێکی‌ترم ••• هیچ نەبێ بەسەر پیپلیکەیەکی ئەم ژیانەدا سەرکەوتووم •• لای ئەوان گرنگ سەرکەوتنەکەیە ، کەس لە خوارەوەی خۆیان نابینن ، ئای لە گێلی‌یان !! کەواتە ئەم شەڕە خوێناوی دەبێ •• حەزیش ناکەم ، بیر لە تۆڵە دەکەمەوە •• بەڵام لەم حاڵەتەی مندا ژنێك کە خۆی بە زیرەك دادەنا ویستی وەکو حەوای دایکی •• ئادەم ئاسایی بمخاتە ناو دۆزەخی ئەم زەوی‌یەوە •• بیرم دێتەوە چۆن شووی بەم گەلحۆیە کرد •• چونکە لە زۆر شتا لە سەرەوەی من بوو •• زەوی‌وزار •• باخ‌و بێستان •• مووچەی ، شەقام ، خانوو ، ئۆتۆمۆبێل ، لەراستیدا نازانم •• بەڵام وەکو هەر پیاوێکی ڕۆژهەلاتیی مەرد پیاوانی شکان‌و رووخاندو سووتاند •• ئەم جارەیان بە خۆین‌و گۆشت بیردەکەمەوە •• بۆ نا ؟! دونیای مێشك‌و خۆ بەخت کردن‌و لێبوردن جێ‌دێڵم • ئەو کە جێی‌هێشتم لوولی‌دام ، تێکی‌شکاندم ، دووقەدی کردمەوە ، فڕێی‌دام •• نەیدەزانی چەندەها

شەو خەوم پێوە بینیوە •• چەندیش لەژێر لێفە شڕەکەمدا بۆی گریاوم‌و کەس نەیدەزانی •• ئێمــە پیــاوانی ڕۆژهەڵات ، پیاوانی گریان‌و ئــاخ‌و ئۆف‌و شەونخونی پشت دیوارە ئەستوورەکان •• ئای کە چیرۆکێــکی درێژە ، وردو درشتم بۆ ناگێڕدرێتەوە •• جــا بۆ ؟ کێ بــە ڕێگایــەکی ناخۆشدا دەگەڕێتەوەو یــەکەم سەفەر شەکەتی کردبێ ، تەنیا یادی ئــەم شتانە ماندووم دەکا •• وێنەی سەدەها ئافرەتی لــە چوارچێوەی دڵمــا شێواند • لە ئاوێنەکەمدا وەکو جنۆکەو جانەوەر دیارن • لە تونێلێــکی تاریکەوە بۆ مەرگم هات ، ناکرێ لەبیری بکەم ••• ئەوساتە لەبیربــکەم کە بۆ دواجار بوو بینیم بەرانبەرم دانیشتبوو ، تەنیا مەترێك لێمەوە دوور بوو ، لە دوو کورسی ڕووبەڕووی یەکتری ئێوارەیەکی درەنگ ••• لە ژوورە بێنازەکەی خۆی •• چاك ئاگام لێی بوو ، یــاری بــە هەڵقــەی زێڕینی پەنجە نەرمەکەی دەکرد • ئەو پەنجەی حەزم‌دەکرد وەك قەنــد بیکرۆژم • تیشکی گڵۆپەکەی سەرسەرمان لە هەڵقەکەی دەدا •• باریکە تروسکەو شەوقی دەپرژایە ناو چاوانم •• منیش لەبەر تیشك‌و ئازاری دەردی خۆم •• چاوەکانم دەنووقاند •• وەکو پشیلەیەکی کزو برسی•• مات ببووم •• چاوەکانم هەڵنەدەهات •• بە زۆرداری وێنە شیرینــەکەی ئەویان دەگرتە خۆیان •

بە بزەوە سەیری دەکردم •• ئای کە زوڵــم بــوو •• زۆربــەی ئێوارەکان ئەو ئێوارە دوورەم بیردەخەنەوە •• لەوە ناخۆشتر چی هەیە، ئێوارەیەکی درەنگ ، هەواڵی کۆستی خۆشەویستیت بۆ بهێنن ؟! هــەر بەئەنقەست نەیهێشت ، بۆ خەم نەیهێشت لێی بپرسم : ئــەم کودەتایــە کت‌وپڕە بۆ ؟ ئەم شۆڕشە سوورە بــۆ ؟ چ‌ئافــرەتێ ئــەم هەمــوو قینــە پڕ لە گاڵتەیە لە دڵیا بشارێتەوە •• وا خۆم دەنوێنم گوایە بێباکم ؛ باسی ئەو کچانەی بۆ دەکەم لەدوای ئەو خۆشیان ویستم • دەبێ وای تێبگەیەنم

من ئەو کوڕەی جاران نیم • وا باسی خۆم دەکەم ، وەکو باسی پایتەختێکی قەشەنگ‌و گەورەو قەڵەباڵغ بکەم • هاوینە هەوارێکی جوانی قەدپاڵی چیایەك ، یان دەریایەکی پان‌و پۆڕو قووڵ ؛ شتێك سنووری نەبێ •• ئەو هێزەی تیامایە بەکاری دێنم : ئاشکراو نادیار • فریشتەیی یان ئەهریمەنیانە • دەبێ زاڵ بم وەکو چۆن چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەو بەسەرما زاڵ بوو •

گاڵتە بەو شتانە دەکەم هەینی ، هەی‌بوون : یان دەیبن • هەموو فەلسەفەو زانیارییەکی مرۆڤانە دەخەمە کار • دەبێ هەست بە شەرم‌و پەشیمانی بکا •• لە چارەکە سەعاتی یەکەما کاس‌و وڕی دەکەم •• هەرەسی بێ‌دێنم : وەکو شاخێکی مەزن‌و بن‌کۆڵ •

بەلای رۆژاوادا ڕوانیت •• خۆر هەزاران هەزار میل لێتەوە دوور بوو • بەڵام هەستت بە ئاشنایەتییەکی قووڵی دەکرد •• ئاشنایی کۆنی تۆو ئەم زەوی‌یە •• دووباڵی مابوو ئاوابێ • چەند پەڵە هەورێکی زەردو ئاڵ بەدەوریا مەیبوون •• شێوەی زۆر سەیریان وەردەگرت • وەکو چەند باڵندەو گیان‌لەبەرێکی کێوی‌وماڵی دەهاتنە بەرچاوت • هەموو شتێك سیحراوی‌یە • سیحرێك دەخەنە سەر ئەو هێزە شاراوەی تۆڵەسەندنەوەت •• هەموو دنیا ببووە چوارچێوەیەکی زێڕین بۆ ئەو شادییە سەوزەت •• بەلای ڕاستا ڕوانیت •• چەپ ڕوانیت •• گەڕەکەکە لە دەریای هێمنی‌دا نقوم بووبو • گەڕەکە پیس‌و پلۆخ‌و پڕ ئاژاوەکەی خۆتان بیرکەوتەوە •• مناڵە رووت‌و مل‌باریکەکانی ناو قوڕاوی کۆلان •• لە گەڕەکێکی‌وا •• هەستدەکەی دەوڵەمەندەکان بێ مناڵ بن •• یان هەر بە گەورەیی لەدایك بووبن •• شۆستەو شەقامی پاکی بەرماڵەکان چۆڵ •• کپی‌و بێ‌دەنگی دەوروبەر ماتی کردی ••

کەواتە تازە بزانی •• ساڵەهای ساڵە •• لە گۆڕستانێکا ژیاویت مردووەکانی هەردەم بەئاگانو لەشەڕدان •• ئەی خوایە کە دەبێ •• شتێکیان بۆ بکەی •• سکت بە خۆتو گەنجی ماڵە هەژارەکان سووتا •• ویستت لەم ساتەدا •• یەکەم کەس کێ بوو دەرکەوت •• لێی بپرسی ••

ئێوە نازین •• کێ بەرپرسیارە ؟!! خوا •• شەیتان •• دڕەندە •• چەتە •• پۆلیس •• دەوڵەمەندەکان •• سەگە بەرەڵڵاکان •• کێ بەرپرسیارە ؟!

کەس •• دەرنەکەوت •• کەس نەبوو بەڕووی پێبکەنی •• بگری •• لەگەڵیا بە شەڕ بێی •• نەفرەتی لێبکەی !••

پەلەی ئەوەت بوو•• دەست بە زەنگەکەوە بنێی لە ترسی کوژانەوەی ئاگری خۆشیەکەت •• دامرکانی بورکانی ناخت •• گەر خەمە کوشندەو هەمیشەیی‌یەکەت بێتەوە •• چی بکەی ؟ ئەگەر هێزی تۆڵەت نەما •• چی‌بکەی ؟ نا •• دەبێ هاملێتێکی سەرکەوتوو بێت ••• تۆڵەی پاڵەوانانی ڕۆمانو شانۆگەری‌یەکان هاتنەوە یادت •• ئیمڕۆ ئێوارە تۆو ئەم ژنە بێدینو دڵە •• شانۆگەری تۆڵە بەڕێوەدەبەن •• پاکو خاوێن•• کەمێك بۆن •• قژت لە ناوەڕاستەوە کەرت کردبوو •• بەوەپەڕی ڕۆمانسیەتەوە •• بەڵام کۆنە جلەکانت کردبوەبەر •• تا وانەزانێ گرنگیت بەم دیدەنی‌یە داوە •• دەشێ •• لەوەیاندا بە هەڵە چووبیت •• بەڵام وات حەز کرد •• لای تۆ مەزنی لە بێباکیدایە •• ژینی بێباکی دەیکوژێ •• ئەوەش یەکێکە لە فەلسەفە پووچەکانت •• بەڵام تۆ ڕێزت بۆ هەموو فەلسەفەکانی خۆت هەیە •• هەموو جارێك •• کە ئارەقی خۆشەویستی هاوڕێکانت دەخاتە سەما •• پێیان دەڵێی •• ئێوە سارد

بن •• ئەوان گەرمن •• وشك بن ئەوان سەوزن •• كە جێیان هێشتن ••
بزەی سەركەوتنیان دەكوژێتەوە •• دەتوێنەوە •• نەگرین •• ڕۆڵەكانم
نەگرین •• دەریایەك فرمێسك هەڵڕێژن ••ئەوان سواری بەلەمی حەزی
خۆیان ئەبن •• هەر بەم دەریایە بە عاشقە تازەكانیان دەگەن •• كە ئەو
كورتە موحازەرەیەت تەواو دەكەی •• هەریەكەی جرتێكی پڕ بە دەمیت
بۆ دەكێشێ !•• ناخ و ناوەوەو ناوەڕۆكیان شارەزای •• مۆخیان دەناسی ••
بەڵام •• نا •• وا خەریكە •وچرِكەیەكی مرۆڤانە •• ختوورەی مەردیو
پیاوەتـی داتدەگرێتـەوە •• دیسانـەوە •• خەریـكە جیـوەی هـێزی
شەیتانیت •• دابەزێ •• بۆ تەنیا یەك جار •• وەكو ئـەو خەڵـكە بـیر
نەكەیتەوە••یاسای كۆنی (حەمورابی) زیندوو نەكەیتەوە؟ ددان بە ددان••
چاو بە چاو •• لووت بە لووت •• پەنجەی شایەتمـانت هـەر بەسـەر
زەنگەكەوە بـوو •• پێش ئەوەی دایبـگری •• بـە هـەموو هەستو
نەستێكتەوە •• چوویتە ژوورەكان •• كەوتیتە هەڵپەی ئەوەبزانیت ••
لەناو ئەم قەڵایە چی ڕوودەدا :

« ئاخۆ تەنیایە •• یان مێردەكەی لەماڵەوەیە •• نابێ لەوێ بێ •••
پیاوی پرۆژە زلەكان •• ئەو پرۆژانەی دەفتەری پانو قەبەیان دەوێ ••
ژمارەی زل •• ژمارە •• ژمارە لەسەر ژمارە •• كۆكردنەوە•• دابەش
كردن •• دەرهێنان •• ژمارە •• ژمارە •• ژمارە •• ئای كە قوتابی
بووم لە سەرەتایی •• لە ژمارەو پێوان چەند گێلو بەستەزمان بووم ••
دەیەها جار لە ترسی مامۆستاكەم •• میزم بەخۆما دەكرد •• [ بە قاچو
قولما دەهاتە خوارەوە •• كە دەگەڕامەوە سـەر كورسیـیـەكەی حـۆم ]
پۆتینـە لاستیكەكەم فلقـەی دەهـات •• منـاڵە چـەتوونەكانی هـاوڕێم
پێدەكەنین •• منیش چیبكەم •• لە شەرمانا بە دڵو بە چاو دەگریام ••
لە زستانا بۆ ماوەیەك گەرمو خۆش بوو •• دوایی هەستم بە ساردی

دەکرد •• قورس دەبووم •• لە هاوینا بۆ ماوەیەك فێنك بوو •• دوایی پێستی پانی دەسوتاندم •• کەواتـە چـۆن بـۆ ببـم بـە بـازرگان •• قۆنتەراتچی •• پیاوی ئەو پرۆژانەی ژمارەی زلیان دەوێ •• هەر لـە منالیمەوە لەگەڵ شێخ ژمـارەو خزمەکانـی دۆستایەتیم نیـیـە •• دایـکە کلۆڵەکەم •• تائێستاش بە چل دەڵێ •• ( دوو جار بیست ) چۆن لەڕێو لاوازیم هەر لە دایكو باوکەوە بۆ ماوەتەوە •• دیارە نەم نەبوونیو نەهاتیەشم لەگەڵ ژمارە •• هەر لەوانەوەیە •• نا ئەم شتـانە نـابێ ورەم پێ بەربدەن •• میردەکەی بەدوای پرۆژەکانییـەوە رادەکا •• هـەر ئێستا •• شەڕ خۆشتر دەبێ کە بەتەنیایە •• دەبێ پاش ئەم چوار ساڵە منالێکی نەبووبێ •• هەر ئێستا ئەوەش دەزانی •••

– سەرت بەرزکردەوە درێژیو پانیو بەرزی کۆشکەکە سەرنجی راکێشای •• بیرت لەوە کردەوە •• چونـە لایەنـە لێپرسراوەکان •• نایکەن بە خەستەخانـە •• خانـووی هەتیـوە زۆرەکانی ئـەم شارە •• شێتخانە •• چێشتخانە •• خانەیەك لە خانەکان •• ئەم کۆشکە زلە •• تەنیا بۆ دوو کەسە •• شەوانە کە درەنگ دەگەڕێتەوە •• ئەم جۆرە کۆشکانە دەبینێ •• تەنیا ژوورێـك یان دوانـی داگیرسـاون •• کەچی ئێوە •• منالانی ماڵە هەژارەکان •• ماڵی تاکە یەك ژوور •• ڕاهاتوون•• هاتو هاوارتان •• هەناسەتان •• گریانتان •• ئارەقتان •• چرە دووکەڵی باوك•• لای‌لایەی پڕ خەمی دایك•• دەنگی پەرەمێز•• هاژەی گۆرانیەکی بریندار •• لە ئاستی رادیۆکانتانەوە •• تێکەڵ بە یەکتری دەبن ، بۆیـە هەقە بترسن •• کە لە بەردەمی ئەم جۆرە کۆشکانە دەوەستن •

– پێش‌ئەوەی بۆ دواجار دەست دابگری ••• دیدەنی‌یە سەیرو مەزنەکەی ( هیسکلیفو کاترین )ت بیرکەوتەوە •• دیدەنی پاش چەند

ساڵ لە ئازارو خەمو برین •• بەڵام •• ئەوەی ئەوپـەڕی لەززەتی •••
موچڕکە دەخاتە دەمارەکانتەوە •• باڵی پێ گرتووی خۆی ویستوویەتی••
بۆ ئەم دیدەنییە •• هەوڵی‌داوە •• بەدرێژایی ساڵی ڕابوردوو •• ئەوەت
زانـی ویستویـەتی •• دەیـەوێ بتبیـنێ هەمـوو ئـەو کەسـانەی
بەنهێنـی چـیرۆكو ترازیدیـای خۆشـەویستی‌یەکەتان دەزانـن ••
پێ‌یـان ڕاگەیاندووی •• بـۆ دواجار پـەردەی لەسـەر ڕووی خـۆی
هەڵماڵیوە •• خۆزگەی ئەم ڕۆژەت بوو ••• دیارە سەرەمەرگە •• ئافرەت
تەنها لە سەرەمەرگا بانگت دەکا •• پێیان وتی لە هەموو شوێنێ ناوت
شیرینـە شـەکرەی سەرزاریەتـی •• لێت دەپرسێ •• وەکـو عاشقی
گورانی بێژێکی غەمبار ••• کە بۆ دوا گۆرانی بگەڕێ ••• دوا هەواڵ ••
دوا چیرۆك •• دوا دەستگیران کەمێك زیاتر لە پێویست هەڵچوویت ••
قەڵەباڵغ دیـاریت •• سـێ چـوار دڵـۆپ ئارەقـە •• بەسەر لووتەوە
دەتروسکێنـەوە •• بیانسڕەوە •• خـۆت خڕکەوە سـەر یـەکتری ••
لەسەرخۆ هێنامانە بیرکردنەوە •• با ڕیسمان لێ نەبێتـەوە بە خوری ••
ئێستا خۆی •• پاش چەند سائێـکی‌تر •• دەرگاکەت بـۆ دەکاتـەوە ••
لەش‌ولارە نەرمو شلەکەی شەپۆل دەدا •• لەناو کراسێکی تەنکی سوور••
سەوز •• زەرد •• نازانی •• بەڵام کاتی خۆی ڕەنگی سەوزی بـەلاوە
پەسەند بوو •• دێو •• وەکو تاووس خۆی دەلەنگێنێ •• دەشێ بـۆنی
سابونو گەرماوی چەند سائێکی لەمەوبەری لێ بێ •• ئەو بۆنەی حەزی
لێ دەکەی •• چەند جوانە دیدەنی •• دیدەنی نێوان کوڕە قەرەجێـكو
شازنی کۆشکێکی قەشەنگ •• وەکو خەونو ئەفسانە وایە •• بەدەسـت
خۆت نەبوو کەوتیتە هەزاران وردە پرسیار :

« بۆ لە بیری نەکردم •• بۆ لە بەهەشتی پڕ لە نازی خۆیدا لە بـیری
نەکردم•• لـەو بەهەشتـەی هەموو کچێـك خەونـی پێوە دەبینـێ ••

ڕووتەڵەیەکی وەکو من •• قەرەجێکی وەکو منی بۆ لە بیر نەکرد •• چۆن لە بیری بکا •• منێك کەوا ••• نا ئــەم نهێنیی‌یە با هەر بۆ خۆمان بێ •• چ‌ییییمنیش شتێکی گەورەم •• کێ ئیمڕۆ ماوە ؟ •• لە هەر قوژبنێکی ئەم دونیایەدا •• بە یادی خۆشەویستی‌یەك بژی •• مردوو ڕۆی •• چەنـد هەزارەها شەو تێ‌بەڕیوە لەناو گەرمــی دۆزەخی ماچەکانیـا لــە بـیری کردووم •• ئای ژن •• تەنیا لەگــەڵ پیاوێــکا ڕابــکشێی هەمــوو شــتێ لەبیردەکەی •• چۆن دەتوانیت بەسەر تەرمی مندا باز بدەی •• باسـك بخەیتە ژێر سەری یەکێکی‌تر •• کە من بەهێــواشی دەمــردم •• تــۆ ئارەقەی سەمات دەسڕیەوە •• پێی‌ناوێ •• هەمووی ڕۆی •• بەڵام مــن پێویستە ئەمڕۆ ئێوارە •• ئەکتەرێکی بلیمەت بم•• پاڵەوانێکی شێتی تۆڵە•• ئەگەر پێستە سپی‌یەکەت کردە ڕەشماڵێك ڕەشەبای تێ بەردەدەم •• گەر بووی بە زەوی‌یەکی وشك •• من نابــارم •• چــاوەکانت بنــە زەنــگی کەلیسایەك •• هەزار ساڵیش زرنگەی بێ •• گــەر عیســاش بــم ڕووی تێ‌ناکەم •• بەرانبەری پەیکەری باڵات قەت نانوشتێمەوە •• قێزو بـێز لەو لەش‌و لارەت دەکەمەوە •• ئەو لەش‌و لارەی دەپەرستیت •• چــەوری دەکەی ••• لوسی دەکەی‌و گەندەترین مووی لەسەر لادەبــەی •• بــە لەززەتێکی سەرسوڕمانەوە •• لە ئاوێنە بازنەیەکانەوە سەیری دەکەی •• نەخێر نامجووڵێنیت•• وردترین دەماری پیاوەتی چی‌یە••؟ دەیسووتێنم••! هەرگیز گەشتێك بەناو کۆڵان‌و شەقام‌و کون‌و قوژبنی لەشتدا ناکەم ••• دەبێ وات لێ بکەم •• وەکو مۆمی بەجێ‌ماوی ئێوارەیەکی درەنگی ســەر گۆڕی پیاوچاکێك بتوێیتەوە •• بتوێیتەوە •• بتوێیتەوە •• دەشێ وا هەست بکەی بە تاڵە موویەکی زوڵفت بمبەستیتەوە •• نا •• با زووکەم •• کەواتە با زەنگەکە ژوورەکان بلەرێنێتەوە •• ئەگەر بزانێ منم •• شــاگەشکە دەبێ •• بزانێ منم زەنگە لە دڵیا لێ‌دەداو دەنگ دەداتەوە ! » •

به هێمنی‌یه‌وه •• یه‌ك •• دوو •• سێ چوار جار •• ده‌ستت بـه‌
زه‌نگه‌که‌وه نا •• بوونت ببوه چاوه‌ڕوانی •• بۆ ئه‌و ساته پڕ له خۆشی‌و
ترسه •• هه‌رئێستا په‌رده‌ی شانۆ ده‌کرێته‌وه •• به‌ڵام زۆر وه‌ستای ••
ده‌نگ نه‌بوو •• بۆنی گۆڕستانێکت کرد •• خشه‌یه‌ك ئاوڕێکی دواوه‌ی
پێدایته‌وه •• زه‌لامێکی خڕ به جاده‌ی کۆڵانه‌که‌دا غل ده‌بۆوه •• خێسه‌ی
لێ کردی •• چاوه‌ڕوان بووی •• دوورکه‌وته‌وه •• ئه‌مجاره‌یان •• بـۆ
ماوه‌یه‌کی درێژتر •• یه‌ك داگرتن ده‌سـتت داگـرت‌و هه‌ڵـنـه‌گرت ••
ژووره‌که زۆر له‌وه دوورتر بوو •• گوێت له زرنگه‌ی زه‌نگه‌که بێ ••
پاش چه‌ند چرکه‌یه‌کی چاوه‌ڕوانی•• خشه‌خشی سۆلێك هاته به‌ر گوێت••
هه‌ستت ده‌کرد که‌سێك به زۆرداری سۆله‌که به‌دوای خۆیدا ڕاده‌کێشێ••
تا گه‌یشته ده‌رگاکه •• له‌وه ده‌چوو چه‌ند میلیکتان له‌نێوان بێ •• چاوت
نه‌تروکاند •• ده‌رگا زله ئاسنینه‌که که‌لێنێکی تێ‌که‌وت •• له که‌لێنێکه‌وه
ده‌م‌و چاوێکت بینی •• ئه‌و ڕووه نه‌بوو که ساڵه‌های ساڵ بوو •• پێی ئاشنا
بووی •• ڕوویه‌کی چرچ‌و پڕ لۆچ‌و ناشیرین •• ڕووی پیره‌ژنێك ••
ڕووی ئـه‌و پیره‌ژنـه سیحربازانـه‌ی شانۆگه‌ری‌یـه‌کانی شکسپیریـــان
بیرهێنایه‌وه •• سامناك‌و دژوار •• خوێن له ڕووتا په‌ڕی •• مردووانه ••
به‌قێزه‌وه •• به بێ‌ده‌نگی له‌ژێـر چـاوه کوژاوه‌کـانی تێی‌ڕوانیـت ••
له‌ترسانا زوو پرسیاره‌که‌ت ئاڕاسته کرد :ـ داپیره گیان •• ئێره ماڵی خاتو
(نه‌سرین)ه ناوی مێرده‌که‌ی ـ به پێکه‌نینێکی گلۆرانه وتت ـ وادیاره بیرم
چۆته‌وه •• داپیره گیان •••

ـ نه‌خێر (به‌تووڕه‌یی‌یه‌وه وتی) •
ـ چۆن وابزانم ئێره خۆیه‌تی •
ـ پێم وتی نه‌خێر (بێ‌ئه‌وه‌ی سه‌یرت بکا) •
ـ به‌س پێیان وتم که‌وا ••••

پیرەژن رستەکەی پێ بڕیتو تووڕەتر لە جاران :

ـ ئا ئهو •• نێرە بیدۆشەیە •• کوڕم تۆ نازانی خاتوو ـ نەسرین ـ وەکو دەرپێو ژێر کراس کۆشکەکانی خۆی دەگۆڕێ ؟! •

ـ توند دەرگاکەی بە ڕووتدا داخست •• تەقـەی کاسی کردی •• لەودیو دەرگاکەوە بۆڵەبۆڵی بـوو •• دوا ڕستەیـت بەلاوە سەیـر •• رستەیەکی وا رووتو لووس •• چۆن لە دەمێکی بێ ددان هاتەدەر •• بـە هەناسە ساردی گەڕایتەوە •• گران هەنـگاوت دەنـا •• وەکو ئـەوەی تەرمێك بەسەر شانتەوە بێ •• زەردی بەری ئاسمـانی بـەردەداو لێـڵتر دەبوو •• هەموو شتێ گۆڕا •• وەك گۆڕانی سروشتێك •• پاش هـەر ڕەشەبایەکی شێت •• کۆڵانە کپەکەت بڕیو خزایتـەوە سـەر شەقامـە سەرەکی یەکە •• دوا شت کە بیرت لێ دەکردەوە •• چڕۆژێکەو دەبـێ بێ •• کە هەموو کەلاوەکان ببن بە کۆشك •• دەنا هەموو کۆشـکەکان دەبنە کەلاوە •

× × ×

# مەسەلەی ئافرەت و تەکنیکی چیرۆک لە «لەودیو دەرگا ئاسنینەکەوە» دا

کەمـال مەمەند

## ١ ـ کاکڵەی چیرۆکەکە :

•••••• کوڕێکی گەنج ئێوارەیەك لـە ئێـوارەکان ، هەسـت بـە شادی‌یەکی بێ‌پایان دەکا •• شادی‌یەکەشی هی ئەوەیە : وادەی ژوانـی لەگەڵ ئافرەتێکدا هەیە •• ئافرەتێك کە بەرلەوەی شوو بکا ، دڵداری ئەم بووە ، بەڵام لەناکامدا هەڵی خەڵەتاندووەو شووی بە پیاوێکی دەوڵەمەنـد کردووە •• بۆیە ئێستا ئەو شادی‌یەی زیاتر شـادی تۆڵەسەندنەوەیـە ، ئەوەتا دوای چەندان ساڵ ئافرەتەکە ناچاری ئەوە بووە بەدوای هەواڵ‌پرسینی ئەمدا عەودال بێ‌و دواییش بۆ ئەو ژووانە ، چاوەڕێ کراوە ، بانگی بکا•• کوڕەکە لە مێشکی خۆیدا پیلانێکی دڵڕەقانەی تۆڵەسەندنەوە دادەنێ •• بەڵام کاتی دەگاتـە بـەردەرگای مـاڵەکەو دوای ماوەیـەك لێـکدانەوەو نەخشەکێشان ، پەنجەی لەسەر زەنگەکە دادەگرێ ، پیرێژنێکی ناشیرین دێتە دەرەوەو پێی دەڵێ : ماڵی نەسریـن خـان لەو کۆشـکە نەمـاون‌و گوازتوویانەتەوە بۆ کۆشکێکی تر ••

ئەمـە هێلێ درشـتی ڕووداوەکانی چـیرۆکەکەن •• بـەڵام کـە چیرۆکنوسێك دێت‌و ڕووداوێکی ئـاوا لـە ژیـانی ڕۆژانـەی مـرۆڤ‌و

بەسەرهاتەکانی وەردەگرێ ، چۆن دەتوانێ بیکاتە ڕووداوێکی نائاسایی‌و نموونەیی‌و مەزن ؟! چۆن ئەتوانێ بیکاتە کارێکی ئەدەبی‌وا کە شایانی ئەوە بێ ، خەڵك گوێی لێ بگرن‌و پێیان خۆش بێ‌و لێیەوە فێر بن‌و مێژووی ئەدەبیش وەکوو پارچەیەکی بایەخدار تۆماری بکات ؟! دەتوانین بڵێین ئەوکاتە ڕووداوەکان لە شێوەی ڕاپۆرتی‌وشك‌و برینگی ڕۆتینی ڕۆژانە دادەبڕێن‌و بۆ ئاستێکی هونەری کاریگەر بەرز دەبنەوە ، کە چیرۆکنووس ئەو ڕووداوانە لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی‌و ئینسانی خۆیاندا وەردەگرێ‌و بە ناوەڕۆکە ئینسانی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان دەوڵەمەندیان دەکات‌و لە بۆتەیەکی هونەری لەباردا کە خزمەتی بیرو ناوەڕۆکەکان دەکات ، دایاندەڕێژێت •

بۆنموونە ، ڕووداوێکی وەك ڕووداوی ئەم چیرۆکە ، واتە پەیوەندی نێوان کوڕو کچ‌و کێشەکانی ئەو پەیوەندی‌یە ، هەروا بە تەنها‌و سەربەخۆ ڕوونادا • بەڵکو وەکو بەشێکی دانەبڕاو لە ژیان ، لە ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵك خۆی دەردەخاو هەل‌ومەرجی کۆمەڵایەتی‌و قۆناغی مێژوویی‌و باری پێشکەوتن یا دواکەوتنی کۆمەڵ‌و بیروباوەڕو یاساو نەریتە باوەکان کاری تێدەکەن • ئەمە لەلایەکەوە ، لە لایەکی دیکەشەوە ، ئەم ڕووداوانە بەسەر مرۆڤ دێن ، مرۆڤیش بوویەکی مەزنی خاوەن هۆش‌و عاتیفەو هەست‌و نەستە •• بۆیە دەبێ چیرۆکنووس تا بتوانێ ، ڕووداوەکان لە کۆمەڵ‌و لە حاڵەتی ئینسانی‌و بیرکردنەوەو هەست‌و سۆزو لێکدانەوەی کەسەکانی چیرۆکەکەی دانەبڕێ‌و ، ئەو ڕاستی‌یەشی لە یاد بێ ، کە هەست‌و خواست‌و بیرکردنەوەی مرۆڤیش ، بە پلەی یەکەم ، باری ژیان‌و هەل‌و مەرجی کۆمەڵایەتی دیاری دەکاو ، لێرەوە پەیوەندی دیالەکتیکی‌یانەو زیندووی نێوان [ زات‌و مەوزوع ] فەرامۆش نەکات •

گەر کاك شێرزاد ئەو ڕووداوانەی چیرۆکەکەی تەنها وەك چەند

هەواڵێکی سادە ، یان چەند ڕووداوێکی تاك ، کە لەگەڵ شەپۆلی کـاتدا سەرئاو کەوتوون ، بۆ ئێمە بگێڕابایەوە ، ئەوا هەرگـیز ئەم چـیرۆکەی ئێستا ، بەمشێوەیە ، لەدایك نەدەبوو . سەرنجێکی دیکە بۆمان دەردەخا ، کە چیرۆکنووس توانیویەتی ، ڕووداوی چیرۆکەکە ، بە هەندێ لایەنی جەوهەری کۆمەڵایەتیو ئینسانی دەوڵەمەنـد بـکاو لـە ڕۆتیـنی ژیـانی بپچڕێتەوە •• وەك :

١ ـ باس کردنی دیوی ناوەوەی پاڵەوانەکە ، واتە هەستو بیرکردنەوەی پاڵەوانەکەو عەکس بوونەوەی ڕابووردوو ، ئێستـاو داهـاتوو ، لـە لێکدانەوەکانی ناو مێشکیدا •

٢ ـ باس کردنی هەندێ حاڵاتی ئینسانی پاڵەوانەکە •

٣ ـ دەرخستنی ئینتیمای چینایەتیو هەندێ لایەنی پێویستی ژیـانی منالی پاڵەوانەکە •

٤ ـ دەرخستنی هەندێ لایەنی جیاوازی چینایـەتیو بەستنەوەیـان بـە ڕووداوەکانەوە •

٥ ـ دەرخستنی ئاستی ڕۆشنبیری پاڵەوانـەکەو هەنـدێ لە هەڵوێستـە فیکری یەکانی •

٦ ـ وەسف کردنی دەوروبەرو ، بزووتنەوەو ڕەفتـاری پـاڵەوانەکەو وەسفی لەش ولاری ژنەکەو نەفسیەتی بورژوازی یانەی ئەو •

گەر هـەروا سەرنجێـکی سـەرپێیی و خـێراش لـە شێـوەی چیرۆکەکەبدەین ، دەبینین ڕووداوەکان بەشێـوەیەکی ئاسـایی ، یـا بـە شێوەیـەکی کلاسیـــکی نەخراونەتـە ڕوو ••• واتــە سەرەتاو دروسـت کردنی گـرێ یـان کۆتـایی بەدی نـاکەین •••

بەڵکو هەموو ڕووداوەکان ، لە چەند دەقیقەیەکی کەمدا ، لە مێشکی پاڵەوانی چیرۆکەکەدا ، کاتێ لە بەردەمی دەرگا ئاسنینەکەدا دەوەستێ ، دێن‌و دەچن ... بەڵام بەرلەوەی باسی شێوەو تەکنیکی چیرۆکەکە بکەین ، دەمانەوێ ناوەڕۆکی چیرۆکەکە شی‌بکەینەوە .
بۆ ئەم مەبەستە ، پێویستە ئەم پرسیارانە بکەین :

پاڵەوانەکە کێیە ؟ چۆنە ؟ سەر بە چ چینێکە ؟ چۆن بیردەکاتەوە ؟!

ئایا هەڵوێست‌و ڕەفتارەکانی سەلبین یان ئیجابی ؟! ئایا ڕووداوەکان بەستراونەوە بە باری کۆمەڵایەتی‌و کێشە قووڵەکانی ناو کۆمەڵگاوە ؟ ئایا ئەم چیرۆکە هیچ ڕاستیەکی داپۆشراو ، یان چاوپۆشی لێکراوی ناو کۆمەڵەکەمان بۆ دەردەخا ؟! ئایا تەکنیکەکە خزمەتی دەربڕینەکە دەکا ؟! ئایا چیرۆکنووس چۆن هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ کاتدا کردووە ؟! ئایا ناوەڕۆك‌و شێوە ، یان حەقیقەتی کۆمەڵایەتی‌و ئینسانی لەگەڵ حەقیقەتی هونەریدا هاوجووتن ؟! ...

## ٢ ـ پاڵەوانەکەو هوشیاری چینایەتی :

پاڵەوانی چیرۆکەکە ، کوڕێکی گەنجە ، تەمەنی هەرزەکاری بەجێ‌هێشتوە .. یەکێك لە خاسیەتە سەرەکییەکانی ئەو کوڕە ، کە هەر لە سەرەتای چیرۆکەکەوە ڕوون‌کراوەتەوە ، ئەوەیە هەستێکی مرۆڤایەتی قووڵی هەیە .. ئەو هەستەش لە ئەنجامی پەنگ‌خواردنەوەی چەندەها خەم‌و ئازاری گەورە لەناو دڵ‌و دەروونیدا ، سەری هەڵداوە.. سەرچاوەی خەمەکانیشی دوو شتن :

١ ـ موعاناتی ڕاستەوخۆ ـ یا موعاناتی هەستی « حسی » واتە یادگاری تفت‌و تاڵی منالی خۆی‌و ژیانی پڕ لە کوێرەوەری خێزانەکەی‌و ماڵە هەژارەکانی گەڕەکەکەی .

٢ ـ موعاناتی ناڕاستەوخۆ ـ یا « زەینی » • کە لە ڕۆشنبیری‌و خوێندنەوەکانی‌یەوە سەرهەڵدەدەن • [ ئەو شەڕو برسێتی‌و لافاوانەی لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو خوێندوونیەتەوە ] •

بەهۆی ئەم ئازارە هەمیشەیی‌یانەوە خەم ئەوەندە بە گیانی ئاشنا بووە ، کە تەنانەت کاتێ حاڵەتی خۆشی‌یەکی کت‌وپڕی هۆ نەزانراو دای‌دەگرێ ، لەوخۆشی‌یە دەترسێ •• دەترسێ کە لە زەمینەی خەمەکان جیا بێتەوەو ، بەرەو ئەستێرەیەکی دیکە بفڕێ •• بۆیە هەر زوو هەوێنی خەمێک دەگرێتەوەو هاوتایی شادی‌و خەم ڕادەگرێ •

« ئەو لە ژیانیا هەر شکێندراوەتەوە • بە منداڵی شەرمن‌و ترسنۆک بووە ، بۆیە ئێستاش دوودڵەو جێی گومانە کە بتوانێ لە کاتی بینینی ژنەکەدا بەڵێنەکەی بەرێتە سەرو تۆڵەی خۆی بسێنێت » •

پاڵەوانەکە سەر بە چینێکی هەژارو چەوساوەیە •• بە منداڵی لە گەڕەکی ماڵە هەژارەکاندا پەروەردە بووە •• ئەو گەڕەکەی لە خانووی قوڕو تاریك پێك‌هاتوون •• دانیشتوەکانی برسین‌و •• مناڵەکانیان بە برسێتی‌و گریان‌و جنێو ڕاهاتوون • چیرۆك‌نووس ئەم خانوانە وەکو ـ ( گۆڕستانێك کە مردووەکانی هەر دەم بەئاگا بن‌و لە شەڕدا بن ) وەسف‌دەکات ••••

کەواتە پاڵەوانەکە لەبەر ئەم چلۆنایەتی‌یەی ژیانی ، هەستی چینایەتی کەمترە ـ یان دەشێ بڵێین هوشیارییەکەی ئاڵۆزەو ڕێڕەوو ڕوانگەی ڕوونی بەدەست نەهێناوە •••

ئەو هەست‌دەکا کە جیاوازی چینایەتی هەیە •• ئەم جیاوازییەش چینە زەحمەتکێشەکان‌و بۆرژوا سەرمایەدارەکانی کۆمەڵ لێك جیا دەکاتەوە••• ئەو هەست دەکا کە ئەم جیاوازی‌یەیە بۆتە هۆی ئەوەی خۆشەویستەکەی

لەدەست بدا •• بەڵام هۆشیاری ئەوە نی‌یە بزانێ چۆن ؟! واتە تەئسیری ئەم جیاوازی‌یە لەسەر مرۆڤی تاك دەستنیشان بکاو ، پەیوەندی دیالەکتیکی‌یانەی نێوان ڕووداوەکان‌و پێشینەو زەمینە چینایەتی‌یەکەیان بدۆزێتەوە • بۆیە ناشتوانێ ئەو ڕقەی هەیەتی ، لە ڕقێکی زاتیەوە بیکا بە ڕقێکی چینایەتی‌و ، دژی هۆو فاکتە ڕاستەقینەکانی بەدبەختی‌یەکەی خۆی بجەنگێ •••

بەمانایەکی‌تر ، پاڵەوانەکە تا ئەو ڕادەیە جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکان تێدەگا ، کە واقیع خۆی ، لە ڕێگای حەواسەکانی‌یەوە ، بە تۆخی دەیانخاتە بەردەمی •• ئەو کاتێ بیرەوەری‌یە تفت‌و تاڵەکانی ژیانی منداڵی دەهاروژێن‌و برینەکانی دەکولێنەوە ، دیمەنی ماڵە هەژارەکانی دێتەوە بەرچاو ، کە لەناو گەڕەکی بۆرژواکانداو ، لە بەردەمی کۆشکە گەورەکانیاندا بە سەرسامی ڕادەوەستێ • [ گەڕەکەکە لە دەریای هێمنیدا نقوم ببوو •• گەڕەکە پیس‌و پڕ ئاژاوەکەی خۆتان بیر کەوتەوە •• منداڵە ڕووت‌و ملباریکەکانی ناو قوڕاوی کۆڵان ••• لە گەڕەکێکی‌وا•• هەست دەکەی دەوڵەمەندەکان بێ‌منداڵ بن •• یان هەر بە گەورەیی لە دایك‌بووبن • شۆستەو شەقامی پاکی بەرماڵەکان چۆڵ ، کپی‌و بێ‌دەنگی دەوروبەر ماتی کردی •• کەواتە تازە بزانی •• ساڵەهای ساڵە •• لە گۆڕستانێکا ژیاویت، مردووەکانی هەردەم بەئاگان‌و لە شەڕدان !! ئەی خوایەکە ••• دەبێ شتێکیان بۆ بکەی !! سکت بە خۆت‌و گەنجی ماڵە هەژارەکان سووتا •• ویستت لەم ساتەدا •• یەکەم کەس کێ بوو دەرکەوت •• لێی بپرسی•• ئێوە ناژین •• کێ بەر پرسیارە ؟!! •

خوا •• شەیتان •• دڕندە •• چەتە •• پۆلیس • دەوڵەمەندەکان • سەگە بەرەڵاکان •• کێ بەرپرسیارە ؟! ] •

لەم بیرو هەڵوێستانەی پاڵەوانەکەوە ، ئاڵۆزی بیرو بەرچاو تاریکی ئەومان بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێ .. ئەو تاڕادەیەك لە مەسەلەی بیرکردنەوەو لێك‌دانەوەی زانستی‌و فیکری‌دا بێ‌تواناو کەم‌دەستە کە دەیەوێ پرسیارەکەی خۆی بەرەو ڕووی یەکەم کەسێ کاتەوە کە لێی دەردەکەوێ ، دیسان کاتێ کە بەرامبەر کۆشکە بەرزەکان دەوەستێ‌و ، جیاوازی‌یەکان خۆیان ئاشکرا دەکەن ، هەندێ خەیاڵی ڕۆمانسی‌یانە لەناو مێشکیدا سەوز دەبن : [ سەرت بەرز کردەوە ... درێژی‌و پانی‌و بەرزی کۆشکەکە سەرنجی ڕاکێشای .. بیرت لەوە کردەوە چۆنە لایەنە لێپرسراوەکان نایکەن بە خەستەخانە ، خانووی هەتیوە زۆرەکانی ئەم شارە ، شێتخانە .. چێشتخانە .. خانەیەك لە خانەکان ] .... لێرەشدا پاڵەوانەکە سنوورە چینایەتی‌یە ڕاستەقینەکان بەدی‌ناکا ... ئەو سەرسامە چۆن لایەنە لێپرسراوەکان ئەو کۆشکە زلانە ، کەخاوەنەکانیان تەنها ژوورێك یا دوو ژووری بەکاردێنن ، ناکەن بەخەستەخانەو قوتابخانەو شتی‌وا .. پاڵەوانەکە بیر لەوە ناکاتەوە کە لە کۆمەڵی چینایەتی‌دا خاوەنی ئەو کۆشکانە خۆیان دەسەڵاتدارو لێپرسراون‌و ، مەسەلەکە وا سادە نی‌یە .

## پاڵەوانەکەو ڕووداوەکانی چیرۆکەکە :

ئێستا کە شتێکمان دەربارەی ڕادەی هۆشیاری پاڵەوانەکە بۆ دەرکەوت ، با بزانین هەڵوێستی ڕاستەوخۆی ئەو بەرامبەر ڕووداوە سەرەکی‌یەکەی چیرۆکەکە ، کە بەسەرهاتی خۆشەویستی خۆیەتی ، چۆنە .

**(١) خۆشەویستیی نێوان کوڕو کچەکەو جیاوازی نێوانیان لە سەردەمی هەرزەکاریدا :**

[ دەچیتە دیدەنی ژنێك چەند ساڵێك لەمەوبەر خۆشەویستت بوو ـ خۆشتدەویست ، زۆریش ، گوایە ئەویش خۆشیدەویستی ـ بەڵام داخ کە جارجارەبـە مناڵی دەزانــی ـ کەچی تـۆ هیچ گومانێـکت لەخۆتدا نەدەبینی ـ سمێڵێکی لاکێش‌و قنجت بەردابۆوە ، دەنگت تا دەهات کەرخ‌و نێرانەتر دەبوو ••• هتد ] •

دیارە ئافرەت کە زووتــر نەش‌و نمــا دەکاو ، زیاتــر لە ڕواڵەت‌و ڕوخساردا سەرنج ڕادەکێشێ ، زووتریش لـە کـوڕ هەست بە نـرخ‌و دەوری لەشی خۆی دەکا، لەبەرئەوە هەرچەندە کوڕ لە کچ بەتەمەن‌تریش بێ ، دەبینین کچەکە خۆی لەو بەکامڵ‌ترو زۆرزانتر دەزانێ‌و هەســت دەکا لە سەرووی ئەوەوەیە •• پاڵەوانەکە تا ئێرە هەست بەمە دەکا، بۆیە دێ حاڵەتی هەرزەکاری خـۆی دەردەخـاو نیشانەکانی پیاوەتـی خـۆی دەژمێرێ •• کەچی لەگەڵ ئەم ڕاستی‌یەشدا هێشتا کچەکە ئەم بە منــداڵ دەزانێ •• هەڵبەتە پاڵەوانەکە گەرچی ڕواڵەتی بایۆلوجی ئەم دیاردەیە ، هەست پێ دەکا ، بەڵام ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتی‌یەکەی تێ نـاگا •• دەسـا با بپرسین ، ئەگەر مەسەلەکە بایولۆجی‌یە بەتەنها ، بۆچی کوڕەکە هەمان هەڵوێستی بەرامبەر کچەکە نەبوو ؟! چ‌جیاوازییەك لێرەدا هەیە ، ئـەو جیاوازییانە نەبێ کە بناغەی کۆمەڵایەتییان هەیە ••

آ ـ لە کۆمەڵی دواکەوتوودا ، کچ دیوارێکی ئەستووری لە چــوار دەورا دروستکراوەو ، ڕێـگای دڵداری‌و تێـکەڵبوونی ئـازادانەی لەگەڵ کوڕا لێ قەدەغە کراوەو ئەم کارەی بەشورەیی دادەندرێ • لەکاتێکدا کوڕ لەلای خۆیەوە ، بەرەڵا کراوەو ، ئازادی‌یــەکی یەکلایی پێ دراوە ••• گەرچی ئەم کارە ستەمێکە لە کچ دەکرێ ،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی یاسای ـ عەرض و تەڵەب ـ بایەخـــی کچی زیاتر کـردووەو قسـەو هەڵوێستی ئەوی بـاڵاتر کـردووە • بەتایبەتی لە پەیوەندییەکانی دڵداری هەرزەکارانەدا •

ب ـ لە کۆمەڵی دواکەوتووی وەك کۆمەڵی ئێمەدا ، چارەنووسی کــچ هەر لە ڕۆژی لەدایكبوونیەوە، تا ڕادەیەك، دەبەسترێتەوە بە جوانی و ناشیرینییەوە• هەر لە منداڵییەوە وادەخرێتە مێشکی ئافرەتەوە کە سەرمایەی ژیانی تەنها جوانی و لەش ولارییەتی و هیچ ئەرکێکی تری لە ژیـاندا لە ئـەستۆدا نییـە • هـەر ئەوسەرمایەشە کە بـازاڕی ئەو گەرمتر دەکا ••• بۆیـە ئافـرەت هـەر کە هەستی بە جوانی و پێگەیشتنی جنسی خۆی کرد ، هەستێکی گەورەی شانازی و شـایی بەخۆبوونیش لە دەروونیدا درووست دەبێ و هەر ئەو هەستەشە پاڵی پێوە دەنێ ، واتێ‌بگا هەموو مەرجێکی ژیانی تەواوکردووەو، خۆی لە کوڕە هەرزەکارەکانی هاوتەمەنی بەرزتر بگرێ ••• لەکاتێکدا کوڕ گەرچی بشـگاتە تەمەنـی هەرزەکاری و لـە ڕوی جنسیشەوە پێ‌بگا ، هێشتا لە سەرەتادایـەو ، ژیـان لـەو داوا دەکا کە خـۆی پێ‌بگەیەنێ و ئەرکەکانی دروستکردن و گوزەرانی خێـزان دابـین بکاو ، شوێنی خۆی لە کۆمەڵدا بکاتەوە • بەڵام دیارە ، باڵەوانەکە، ئەم ڕاستیانە تێ‌ناگات و بەگوێرەیان ، هەڵوێستی خـۆی بەرامبـەر خۆشەویستی و [ خۆشەویستە ـ گریمان کـراوەکەی ] ، دیـاری ناکا ••• بۆیە ناشتوانێ لـەدواییدا ، هـۆی ڕاستەقینەی ژەنــگ هێنانی ئەو خۆشەویستییـەو ، دوورکەوتنـەوەی کچەکە لێی ، دەرك پێ‌بکات •

## (٢) شووکردنی کچەکەو هەڵخەڵەتاندنی کوڕەکە :

[ ژنێك کە خۆی بە زیرەك دادەنا •• ویستی وەکو حەوای دایکی ، ئادەم ئاسایی بمخانە ئەم زەوی‌یە •• بیرم دێتەوە •• چۆن شووی بەم گەلحۆیە کرد •• چونکە لە زۆر شتا لە سەرەوەی من بوو ، زەوی‌وزار ، باخ و بێستان ، مووچە ، خانوو ، شەقام •• ئۆتومبێل ••] لەکاتێکدا پاڵەوان هەست دەکا ، کە جیاوازی چینایەتی بوو ، ئەو کچەی ڕاکێشا شوو بە پیاوێکی خاوەن زەوی‌و باخ‌و ئۆتومبێل‌و ئەو جۆرە شتانە بکا ، هوشیاری تەواو نیە تا ئەم ڕاستی‌یە بخاتە چوارچێوەی مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی خۆیەوەو قەناعەت‌و هەڵوێستی خۆشی لەسەر ئەم بناغەیە داڕێژێ •••

لەبەر ئەوە هەر لەوکاتەدا کە ئەم هەستە چینایەتی‌یە واقیعی‌یە هەیە ، باوەڕ بەو ئەفسانەیەش دێنێ کە ئافرەت هەر نەوەی حەوایەو ، لە ئەزەلەوە هەڵەکردن‌و هەڵخەڵەتاندنی پیاوو دۆزەخ بۆ سازکردنی بە میرات بۆ ماوەتەوە • تێ‌نەگەیشتنی شوێنی ڕاستەقینەی ئافرەت لە کۆمەڵی چینایەتی‌داو ، تاڵان‌کردنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەو خۆی هۆش‌و بیرکردنەوەو خواستی ئەو لەو کۆمەڵەداو ، داگیرکردنی مافی ئەو لە بڕیاردانی‌چارەنووسی خۆی‌و بەشداری کردنی لە خەباتی کۆمەڵایەتی‌دا ، تێ‌نەگەیشتنی هەموو ئەمانە وای لێ کردووە تاوانەکە بەرەو ڕووی ژنەکە بکاتەوەو ئەو بە تاکە لێپرسراو بداتە قەڵەم • هەر بۆیەشە کە هەموو تین‌و توانستێکی خۆی دەخاتە کار تا هەستی ناسك‌و بیرکردنەوەی ئینسانی خۆی فرامۆش بکاو هەموو قین‌و ڕقێکی خۆی بەرامبەر ژنەکە بخاتە جۆش‌و بیکاتە نیشانەی تۆڵەیەکی مەزن کە خۆی بە پیرۆزی دادەنێ‌و شانۆی ژووانەکەیان بە مەیدانی شەڕی « تەڕوادە » دەزانێ •

[ ئەو هێزەی تیامایە بەکاری دێنم ، ئاشکراو نادیار ، فریشتەیی یان

ئەهریمەنیانە •• دەبێ زاڵ بم وەکو چۆن ساڵانێك لەمەوبەر ، بەسەرما زاڵ بوو ، گاڵتە بەو شتانە دەکەم هەنسی ، هەیبوون ، دەیبن ، هەموو فەلسەفەو زانیارییەکی مرۆڤانە دەخەمە کار ، دەبێ هەست بە شەرمو پەشیمانی بکا ] •

پاڵەوانەکە ناتوانێ ئەو ڕاستی‌یە دەرك پێبکا ، کە مەسەلەی شووکردنی کچەکە بە پیاوێکی دەوڵەمەند ، لەوەوە نەهاتوە کە ئەو پیاوە خۆشی ویستووەو شەیدای بووە ••• چونکە مەسەلەی ژنهێنانو شووکردن ، لەناو خێزانەکانی بۆرژوادا ، بە شێوەیەکی گشتی ، لە مەسەلەی خۆشەویستی‌یەوە دوورە • خۆشەویستی‌یەکە لەوە تێناپەڕێ کە کابرای بۆرژوا ، یا کوڕی کابرای بۆرژوا ، چەند جارێك کچەکە ببینێو لەش‌ولاری بە دڵ بێ ، بەڵام بناغەی تەواو بوونی ژنهێنانو شووکردنەکە وەزعی چینایەتی هەردوولایە ، واتە بەرژەوەندی ئابووریو کۆمەڵایەتی‌یە •• ئەو دوو خێزانە بۆرژوازی‌یە دەیانەوێ قازانجو بەرژەوەندی خۆیان پێکەوە گرێ دەن ، لەم سەودایەدا نەك تەنها ئافرەتەکە وەك ئینسانێك کە چارەنووسی تەواوی ژیانی بە ئینسانێکی‌ترەوە دەبەسترێتەوە بایەخی بۆ دانادرێ ، بەڵکو نرخی پیاوەکەش ، بەخاسیەتو ڕەوشتو سیفاتی ئینسانی ، پیاوەکە دیاری ناکەن ، بەڵکو ئەو ماڵو پارەو سامانەی کە هەیەتی !! •• لێرەوە زۆربەی کات ئەم جۆرە هاوسەری‌یە ، بە پەشیمانی ، یا بەرەڵایی‌و خیانەت دوایی دێ ••• خیانەت لەلایەن ژنەکەوە ، دەڵێین لەلایەن ژنەوە ، چونکە لە کۆمەڵی ئێمەدا پیاو ، بەتایبەتی کە دەوڵەمەند بوو ، لە خیانەت کردنا لە ژنەکەی ئازادەو عەیبێکی تێدا نی‌یە ••• بەتایبەت بەنیسبەت سەرمایەدارە بۆرژواکانەوە ، خیانەت دەبێتە بەشێکی جەوهەری ژیانیانو ، بە شانازی‌یەوە لەسەر مێزەکانی مەستی‌دا باسی موغامەراتی خۆیان دەکەن •• بەڵام بەنیسبەت ئافرەتەوە ، کە دوای

چەندەها ئازارو تاقی کردنەوەی تفت و تاڵ ، ئەو ڕاستی یەی بۆ دەردەکەوێ کە لەلایەن مێردەکەیەوە ، هیچ نرخ و بایەخێکی وەك مرۆڤ بۆ دانادرێ و پارەو سامانیش ناتوانن مرۆڤایەتی و کەرامەتی ئەو بپارێزن و ، کۆمەڵ و یاساش هیچ دادێکی ئەو ناپرسن ، خۆشی ئەو هوشیاری و ئامادەیی یەی نیە تا وەکوو پاڵەوانێك یاخی بێ و چارەسەری گیروگرفتەکەی بکا ، ناچار دەبێ لەدوایی دا ئەویش بخزێتە ئەو حاڵەتەوە کە بۆ ئەو بە خیانەت دادەندرێ و بۆ مێردەکەی بە پیاوەتی .. با لێرەدا بگەڕێینەوە بۆ خۆشەویستی پاڵەوانەکە ، بۆ کچەکەو ، بپرسین ؟ گەرچی ئەو کچە لەپێناوی سامان و سەرمایەو کۆشك و ئوتۆمبێلدا ، کوڕەکەی فرۆشت و شووی بە پیاوێکی دەوڵەمەند کرد بەڵام ئەنجام چی بوو ؟!

ئەو لە کۆشکێکی وا گەورەو خۆشدا دەژیا ، کە تەنانەت کوڕەکە ، کاتێ لە بەردەم دەرگا ئاسنینەکەی دا دەوەستێ ، هەست بە ترس و سام دەکا .. بەڵام کچەکە بە قسەی پیرێژنەکە بێ ، دەتوانێ ئەو کۆشکانە وەك ژێر کراسەکانی بگۆڕێ . کەواتە لە ڕووی پارەو سامانەوە لە هیچی کەم نیە ... بەڵام بۆچی تەنها دوای دوو سێ ساڵ ، لەوپەڕی پلەی بەرزی خانمێتی دا ، پەردەی شەرمی دڕیوەو ، ناوی خۆی خستۆتە سەر زاری خەڵك !

[ بەدرێژایی ساڵی ڕابووردوو ، ویستوویەتی و دەیەوێ بتبینێ . هەموو ئەوکەسانەی بە نهێنی چیرۆك و تراژیدیای خۆشەویستیەکەتان ، دەزانن ، پێیان ڕاگەیاندووی بۆ دواجار پەردەی لەسەر ڕووی خۆی هەڵماڵیوە .. پێیان ووتی لە هەموو شوێنێ ناوت شیرینە شەکرەی سەر زارێتی .. لێت دەپرسێ .. وەکو عاشقی گۆرانی بێژێکی خەمبار کە بۆ دوا گۆرانی بگەڕێ .. دوا هەواڵ - دوا چیرۆك - دوا دەستگیران .. کاتێ چیرۆك نووس وەك بەشێکی گشتی لە تەکنیکی چیرۆکەکە ، کە

مەبەستی ئەوە نی‌یە ، گرێ‌یەك پێشکەش بکاو دوایش حەلی بکا ، ئەم مەسەلەیەشی بە ئاواڵەیی هێشتۆتەوە •• بەلام لە چەند وتەو لێکدانەوەیەکی ناو مێشکی پاڵەوانەکەدا ، کلیلی تەفسیرو ڕوون‌کردنەوەمان بەرامبەر بەم مەسەلانە ، دەداتێ •• کاتێ کوڕەکە دەڵێ •••

[ گاڵتە بەو شتانە دەکەم ، هەنی ، هەیبوون ، دەیبن ، دەبێ هەست بە شەرمو پەشیمانی بکا ] •

پاڵەوانەکە تەواو هەست دەکا ، کە ئەم هەڵوێستەی کچەکە ، هەلی ئەوەی دەداتێ وای لێ‌بکا لەو ماڵو سامانو شتانە پەشیمان بێتەوە کە هەیبوونو دەیبن ، واتە لەئەنجامدا ، هەڵوێستی کچەکە هەڵگەڕانەوەیە لەو ژیانەی پارەو سامانی پێ‌بەخشیوە ، بەلام هەستو سۆزی گەرمی خۆشەویستی‌و ڕێزو خۆشی بێ نەبەخشیوە • ژیانی لەگەڵ پیاوی بورژوازی خاوەن بەرژەوەندی گەورە • ئەو پیاوانە کە چیرۆك‌نووس زیرەکانە وەسفیان دەکا بە [ پیاوی پڕۆژە زلەکان ] •

[ ئاخۆ تەنیایە یان مێردەکەی لە ماڵەوەیە ـ نابێ لەوێ بێ ـ پیاوی پڕۆژە زلەکان •• ئەو پڕۆژانەی دەفتەری پانو قەبەیان دەوێ •• ژمارەی زل •• ژمارە لەژێر ژمارە •• ژمارە لەسەر ژمارە ـ کۆکردنەوە •• دابەشکردن ـ دەرهێنان ژمارە ـ ژمارە ـ ژمارە ] ـ لێرەشدا چیرۆك‌نووس کلیلێکی‌ترمان دەداتێ بۆ لێکدانەوەی مەسەلەی پاشگەزبوونەوەی کچەکە ـ کلیلێکی سەرەکی ـ مێردەکەی لەبەر پڕۆژە زلەکان کەمتر بۆی‌دەکرێ بچێتە ماڵەوە •• خۆ گەر لە ماڵەوەش بێ ، ئەوا هەر باس باسی ژمارەو کۆکردنەوەو دەرهێنانە ـ گرنگی دانی چیرۆك‌نووس بە مەسەلەی ژمارەو دووبارەکردنەوەی ئەو مەبەستە سەرەکییەش دەدا بەدەستەوە کە ژمارە تێکەلێ ناخی ژیانیان بووە •• ژیانیان وشکە ، بێ‌هەستە ، بێ‌سۆزە ، ڕەقو

تەقە ، وەك ژمارە •• هەر ئەم ژیانە وشکەشە کچەکەی وا لێکردووە بگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستە کۆنەکەی‌و پەنا بەرێتە بەر ئەوو وەك دوا گۆرانی خەمبار ، دوا دەستگیران ، هەواڵی بپرسێ ! ••• وەك وتمان پاڵەوانەکە ، کە لە ڕێگای ژیان‌و بەرەوڕوو بوونەوەی ڕۆژانە ، لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیداو لە ڕێگای ڕۆشنبیری خۆیەوە ، ئەتوانێ هەندێ لایەنی جیاوازی چینایەتی دەستنیشان بکاو ، شارەزای ژیانی دەوڵەمەندە سەرمایەدارەکان بێ ، بەڵام ناتوانێ ئەم ڕاستیانە وەك یاسایەکی زانستی کۆمەڵایەتی چەسپاو تێ‌بگاو ، لەبەر ڕۆشنایی ئەو یاسایانەدا ، هەڵسەنگاندنێکی تازەی کچەکە بکاو ، هەڵوێستی باشتری بەرامبەر وەربگرێ • تەنانەت لەم‌کاتەشدا کە کچەکە وەك دوا دەستگیران هەواڵی ئەو دەپرسێ ، ئەم هەر خەیاڵی لای تۆڵەسەندنەوەیە • ئەو هەر وەك مرۆڤێکی شەرقی ـ کە خۆی ئەم وەعیەی هەیە ـ کەوتۆتە ژێر کارتێ‌کردنی بیروباوەڕی سەردەی دەرەبەگایەتی دوورو درێژو لەگەڵ ئەو ڕۆشن‌بیری‌و هوشیاریەشیدا ، ناتوانێ خۆی لەژێر ئەم کارتێکردنە دەربێنێ ••• لێرەوە ، شووکردنی کچەکە ـ بە کەرامەت شکاندنی خۆی دادەنێ‌و ، شیرو تیری تۆڵەی لێ دەسوێ !؟!

ئایا کوڕەکە ئەگەر مرۆڤێکی ئاوا شەرقی‌و پاڕاو ، نەشارەزای یاساکانی کۆمەڵایەتی نەبووایەو ، لە کۆمەڵێکی ئاواشدا نەبایە ، نەدەکرا چارەسەریەکی‌تر بێجگە لە تۆڵە لە مەیدان‌دا هەبێ ؟!

جارێ کە کچەکە ، بۆ کوڕەکە دەگەڕێتەوە ، ئەوە مانای وایە کە کچەکە نەك تەنها لە مێردەکەی تۆراوە ، بەڵکو لەو هۆیە ئابووری‌و بارە کۆمەڵایەتی‌یەش تۆراوە ، کە لەکاتی خۆیدا ئەوی تووشی ئەو شووکردنە کرد ؟ کەواتە ئەوو کوڕەکە ـ بەیەکەوە ـ ناتوانن ئەو هەڵەیە

ڕاست کەنەوە ؟ واتە بۆ ناکرێ بە یەك بگەنەوە ، بۆ کوڕەکە بیر لەمە ناکاتەوە ؟!

من ، کە ئەم ڕستەیە دەڵێم ، دەزانم کە ئەم پرسیارە ڕەنگە هێندە سەیرو نائاسایی بێتە بەرگوێ ، کە هەندێ کەس مووچڕکیان بە لەشدا بێ ؟! چۆن ژنێکی بەمێرد ، کە مێردەکەی خۆی خۆش ناوێ ، دوای چەند ساڵ شووکردن ، لەگەڵ ئەو کوڕەدا کە هەستدەکا دوا گۆرانی ژیانێتی ، بێتە هاوسەر ؟! بەڵام پێویستە ئەو پرسیارە بەرەوڕووی پاڵەوانەکە بکەینەوە ، تا حەقیقەتی کۆمەڵایەتی مەسەلەکە ، بدۆزێتەوەو ، بەڕاستی تێبگا ، کێ تاوانبارە ؟! جارێ ، بۆچی کارێکی نەشیاوە ؟! ئەگەر ژنێك بە مێردەکەی ڕازی نەبوو ، وازی لێ بهێنێ ؟!

بێگومان ئەمە تەنها لە کۆمەڵانی دواکەوتوودا ، کارێکی نەشیاوە ، چونکە کۆمەڵو یاسا ڕێگا نادەن ...چونکە تەڵاق بەدەست پیاوەوەیە، چونکە پاشماوەی بیری دەرەبەگایەتیو بۆرژوازییەتی خۆپەرست ئەمە بە کوفر دادەنێ ؟ چونکە هەر ئەو یاساو هەلو مەرجە ماددیو ئابوورییانەو ئەو بیرو هەڵوێستە باوانەی ئەو کچەیان کاتی خۆی خستۆتە داوی پارەو سامانەوە ، هەر ئەوانەشن کە بەدرێژایی تەمەنی دەیکەنە دیلی ئەو پارەو سامانەو ئینسانییەتەکەی لێ دادەماڵن !!

کەواتە مەسەلەکە ئەوە نیە کە ئەم کارە خۆی لە خۆیدا نەشیاوە بەڵکو لەبەرئەوەیە کۆمەڵ بە نەشیاوی دادەنێ !

بەڵام پاڵەوانە شەرقییەکە ، تۆزقاڵێك بیری بۆ ئەم مەسەلە کۆمەڵایەتییانە ناچێو سوورە لەسەر تۆڵەسەندنەوەکە .. شووکردنی کچەکە برینێکی ئەوەندە قووڵی لەسەر دڵیدا هەڵکەندوە ، کە نەك هەڵوێستێکی توندو کەللەڕەقانەو نەگۆڕی بەرامبەر کچەکە وەرگرتووە ،

بەڵکو گرێیەکی دەروونی گەورەشی بەرامبەر ژن بە گشتی ، لە لا ، دروستبووە •

[ ئەو کە جێی‌هێشتم لووولی دام ، تێکی‌شکاندم ، دووقەدی کردمەوەو فڕێی‌دام ••• تەنها یادی ئەم شتانە ماندووم دەکا ، وێنەی سەدەها ئافرەتی لە چوارچێوەی دڵما شێواند ••• لە ئاوێنەکەمدا وەکوو جنۆکەو جانەوەر دیارن ] •

بەڵێ : مەسەلەکە لای ئەو ئەوەنده زاتیو یەکلایەنی‌یە ، کە وای لێهاتوە هەموو ئافرەتێك لای ئەو وەکوو جنۆکەو جانەوەر خۆیان بنوێنن ••• بۆیە بێجگە لەوەی کە هەموو ڕقێکی خۆی کۆکاتەوەو ، هەموو هەستێکی‌تر بەلاوە بنێ‌و ، لەگەڵ دەستپێداهێنانی زەنگەکەدا ، چاوەڕێی دەستپێکردنی شانۆگەری تۆڵە بێ ، هیچ چارەسەری‌یەکی‌تر شك‌نابا •

## کۆتایی چیرۆکەکە :

تا ئێستا لە شیکردنەوەکەماندا ، گەیشتینە ئەم ئەنجامە :

کێشەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەو ، هەڵوێستێکی زاتی تەسك •

چیرۆكنووس چۆن کۆتایی بەم مەسەلەیە هێناوە ؟! ئایا پاڵەوانەکە لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا ، بە مرادی خۆی دەگاو تۆڵە دەستێنێتەوە ؟!

ئایا ئەم هەڵوێستەی پاڵەوان کێشەکە چارەسەر دەکا ؟!

چیرۆكنووس بەم کۆتایی‌یە نائاسایی‌یە کتوپڕەی بوعدێکی گەورەی داوە بە چیرۆکەکەو ، نرخ‌و بایەخی ئایدیولوژی مەسەلەکەی پاراستووە•• ژنەکە لەو کۆشکە نەماوەو چۆتە کۆشکێکی‌تر !! گەرچی پیرێژن

خانمەکەی خۆی بەوە تاوانبـار دەکا کـە کۆشـکەکانی وەك ژێـر کراس دەگۆڕێ ، بەڵام پیرێژن تەنها ڕواڵەتو دیوی دەرەوەی خانمی بینیوە ‎•‎•
مادام ژنی پیاوێکی سەرمایەدارە دەبێ ئەو دەسەڵاتەی هەبێ ‎•‎ پیرێـژن ، وەك هەرکەسێکی تری کەمفامی کۆمەڵ کە بیرو بۆچوونـەکانی ، بـیرو بۆچوونی باوی ناو کۆمەڵە ‎•‎ ئاوا بیردەکاتەوە ‎•‎ بەڵام حەقیقەتەکە لـەوە گەورەترە !!

لەم کۆتاییی‌یەدا چیرۆکنـووس ، بەبـەواوی تەسكو تروسـکیو نازانستی بیرو لێکدانەوەو هەڵوێستی پاڵەوان ئاشکرا دەکا ‎•‎•‎•

هێشتا خانم یاریی‌یەکە بەدەست کۆشکەکانەوە ‎•‎•‎ لەم کۆشك بۆ ئەو کۆشك دەچێ ‎•‎•‎ بەڵام بە ئارەزووی خۆی نا ‎•‎•‎ بـە ئـارەزووی پـارەو سامان ، بە ئارەزووی مێردەکەی ‎•‎•‎ یان بەپێی ئەو بارە ناچارییەی تووشی بووە !

کەواتە هێشتا لایەنە ئابووریی‌یەکە زاڵە ‎•‎•‎ هـەر ئەم لایەنـەی کـە کچـەکەی لەدەسـت کوڕەکـە دا ، ئێستـاش تـووشی شـکانەوەو ، داپەڵوسینێکی‌تری خواستە زاتیی‌یـەکەی دەکـا ‎•‎•‎ تەنهـا لێرەدایـە کـە پاڵەوانەکە ، تێگەیشتنو زانیـاریی‌یە کۆمەڵایەتیی‌یەکانی لەئـاستی نـابینی هەستیی‌یەوە ، دەگوێزرێتەوە بۆ ئـاستی دەرکپێکردنی زەینی ـ ئەو ئێستا دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە کێشەکە گەورەترە لەوەی کێشەی خیانەتی تاقە کچێك بێ لە مەسەلەی خۆشەویستیدا ‎•‎•‎•‎ ئەو ئێستا دەزانێ کە کێشەکە، کێشەی نێوان کۆشکەکانو کەلاوەکانە ، ئەوانـەی لە کۆشـکا دەژیـنو ئەوانەی لە کەلاوەدا دەژین ، کێشەی نێوان بورژواو زەحمەتکێشەکان ، کێشەی چەوسێنەرو چەوساوەکانـە ‎•‎•‎•‎ بۆیـە دواشـت کە بـیری لێ دەکاتـەوە ‎•‎•‎ ئەوەیە :

[ چڕۆژێکەو دەبێ ببێ •• کە هەموو کەلاوەکان ببن بە کۆشك ، دەنا هەموو کۆشکەکان دەبن بە کەلاوە !! ]

ئەم بیرکردنەوەیەی دوایی پاڵەوانەکە ، ئاکامی ڕقێکی ئەستوورە ، ڕقێك کە لە بێهیوایی‌و تێشکانەوە سەری هەڵداوە ، بێهیوایی‌و تێشکانێکیش کە لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی بوچوونەکانی لە بەرامبەر سەختی‌و دژواری واقیعی چینایەتی‌دا ، تووشی هاتووە •• بۆیە ئەم بیرکردنەوەیەش زیاتر ڕۆمانسییانەیەو ، ڕق‌و پیش‌خواردنەوەی ڕۆمانسیانەی پێوە دیارە • ڕۆژێکەو دەبێ ببێ ؟ بەڵام چۆن دەبێ ؟ ئەمە خەونێکە لە توانای بیرکردنەوەی ئێستای ئەودا نیە •

## هەندێ لایەنی هونەری :

کاك شێرزاد لەم چیرۆکەدا ، وەك لەپێشەوە پەنجەمان بۆ ڕاکێشا ، پشتی بە داڕشتن‌و گێڕانەوەی کلاسیکی نەبەستووە ••• ئەو نەهاتووە ، کۆمەڵە ڕووداوێك بێنێ‌و لە هەر یەکێکیاندا گرێیەك دروست بکاو ، دوایش ئەو گرێیانە بکاتەوە ••

ڕووداوەکە تەنها یەك‌ڕووداوی سەرەکی‌یەو پەل‌وپۆی نەهاویشتووە بۆ ڕووداوی‌ترو لەگەڵیاندا تێکەڵ نەبووەو تەنها یەك پاڵەوانمان هەیە کە سیماو ڕوخساری دیاری خۆی هەیەو ڕێڕەوی ڕووداوەکان دیاری‌دەکا : ئەویش کوڕەکەیە• هەموو ڕووداوەکەشی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە مێشکی کوڕەکەدا ، لە چەند دەقیقەیەکدا کاتێ بەڕێوەیە بۆ ژوانی ئافرەتەکەو ، لەبەر دەرگا ئاسنینەکە دەوەستێ ، ڕوودەدا ••• چیرۆك‌نووس مەسەلەکانی هاروژاندوون بە بێ‌ئەوەی چارەسەری ڕاستەوخۆو کۆتایی‌یان بۆ دابنێ •• ئەم کارەش بەهۆی ئەو تەکنیکە زیرەکانەوە کە بەکاری هێناوە

زیانی لە بنیاتی چیرۆکەکە نەداوە •• چونکە وەك گوتمان چیرۆکەکە پشتی بە چەند گرێیەك نەبەستووە کە بە شێوەیەکی ئۆرگانی بەیەکەوە بەسترابن و لەڕووی پەرەسەندنی درامیی یەوە کار بکەنە سەر یەکتر ••• لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی هێزێکی درامی بدا بە هەموو لایەنەکانی چیرۆکەکەو ، لەدەوری تاقە گرێیەك کۆیان کاتەوە کە ئەویش کردنەوەی دەرگا ئاسنینەکەو چاوەڕێ کردنی شانۆگەری تۆڵەی نێوان پاڵەوانەکەو ژنەکەیە •••

چیرۆكنووس « هۆشڕێژ ـ تیار الوعی »ی بەکار هێناوەو ، ئازادی داوە ، بە پاڵەوانەکە لە ڕێگای تێکەڵ کردنی تەداعی و فلاش باك و بەراوردو لێکدانەوەدا ، سنوورەکانی کات بشکێنێ و ، هەموو ئەو بیرەوەریانەی ڕابردوو ، بەرامبەر ئەو نیازو ئاواتانەی بۆ ئایندە لە مێشکیدان دایان بنێ و ، هەموویان لەدەوری گرێ سەرەکیی یەکە ، واتە چاوەڕێ کردنی کردنەوەی دەرگا لە هەلۆێستی ئەوسای کوڕەکە کۆبکاتەوە • هەر بۆیەشە ناونانی چیرۆکەکە بە «لەودیوو دەرگا ئاسینەکە»و ڕاکێشانی پاڵەوانەکە بۆ ئەوەی بەسەرهاتەکەی لە بەردەمی ئەو دەرگایەدا بکاتەوە ، گرنگیی یەکی هونەری و فیکری گەورەی ـ سەبارەت بە چیرۆکەکە ، هەیە ••••

ئەو دەرگا ئاسنینە هەروەك چۆن واقیعێکی بەرچاوە ، هەرواش ڕەمزە ، بۆ واقیعە چینایەتی یەکە ••• ئەو دەرگا ئاسینەیە کە دیوارێکی گەورەی خستۆتە نێوان ڕابردووی کوڕەکەو ئێستایەوە ••• هەموو ئەو بیرەوەری یە تفت و تاڵانەی کوڕەکە لە دەرگاکەدا هەڵیان دەڕێژێ ، ئەو دەرگا چینایەتی یە دروستی کردوون ••• بۆیە ساغ بوونەوەی کێشەکەش بەستراوەتەوە بە کردنەوەی دەرگاکەوە •

کۆتایی کوتووپڕی چیرۆکەکە بەشێکی گەورەی چیرۆکەکەی

پێك‌هێناوه له ته‌كنیكه‌كه‌یدا ، دیسان ئه‌م كۆتاییی‌یه یارمه‌تی چیرۆك‌نووسی داوه : خۆی له كردنه‌وه‌ی گرێ سه‌ره‌كی‌یه‌كه ـ وه‌ك گرێی هونه‌ری ـ بپارێزێ ؟ ئایـا كوڕه‌كه ده‌توانێ تۆله بستێنێتـه‌وه ؟!• كوڕه‌كه كه لـه ڕابردوودا هـه‌ر تووشی شـكاندنه‌وه‌و داپه‌ڵۆسینی خواست‌و هیواكانـی هاتووه ، به شه‌رمنی‌و ترسنۆكی ڕاهاتووه [ ترسانی له مامۆستاو لـــه ژماره له مندالی‌دا ] [ له‌ڕی‌و لاوازیم له دایك‌و باوكه‌وه بۆ ماوه‌ته‌وه ] دیسان ئـه‌م پاڵه‌وانـه هوشیـاری ده‌رباره‌ی هه‌مـوو كردارو جوڵانه‌وه‌و هه‌ڵوێستێـكی خـۆی هه‌یـه •• ئـه‌م هوشیـاری‌یه‌ش وای لـێ‌ده‌كا زۆر لێك‌بداتـه‌وه •• زۆر لێـكدانه‌وه‌ش ده‌سپێشخـه‌ری ئیش‌كـردن‌و كـار ڕاپه‌ڕاندن سارد ده‌كاته‌وه ، جگه له‌وه‌ی كه خه‌م‌په‌رست‌و هه‌ست ناسـكه ، ڕه‌نگه هه‌ر ئه‌مه‌ش ڕێگه‌ی نه‌دا له‌كاتی به‌ره‌وڕوو بوونه‌وه‌ی ژنه‌كه‌دا ، ئه‌و هه‌ستی تۆڵه‌یه‌ی بمێنێ ـ ته‌نانه‌ت خۆی ئه‌و گومانه ده‌رده‌بڕێ كاتێ خۆی له‌گه‌ڵ هاملێتدا به‌راوورد ده‌كا • هاملێتێك كه له‌گه‌ڵ ئه‌وپه‌ڕی ئاره‌زووشیدا بۆ تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه له مامی ، نه‌یتوانی ئه‌م كاره ئه‌نجام‌دا •• [ گه‌ر خه‌مه كوشنده هه‌میشه‌یه‌كه‌ت بێته‌وه چی‌بكه‌ی ؟! ئه‌گه‌ر هێزی تۆڵه‌ت نـه‌ما چی‌بكه‌ی ؟! نا •• ده‌بێ هاملێتێكی سه‌ركه‌وتوو بیت ••]

به‌ڵام وه‌ڵام‌دانه‌وه‌ی ئـه‌م پرسیـاره : ئـایا پاڵه‌وانه‌كه به‌ڵێنی تۆڵـه سه‌ندنه‌وه‌كه‌ی دێنێته‌دی یان نا ؟! هیچ گرنگی‌یه‌كی سه‌باره‌ت به ناوه‌ڕۆكی چیرۆكه‌كه بـۆ نه‌مـاوه‌ته‌وه ••• چونـكه به‌هـۆی ئـه‌و ته‌كنیكه‌وه كـه چیرۆك‌نووس به‌كاری‌هێناوه ، كرداره‌كان‌و هه‌ڵوێسته‌كان هه‌موو لـــه مێشكی پاڵه‌وانه‌كه‌دا له چه‌ند ده‌قیقه‌یه‌كی كه‌مدا ڕووده‌ده‌ن • پاڵه‌وانه‌كه حه‌قیقه‌تی خۆی ده‌رده‌خا ، ده‌ری‌ده‌بڕێ كه به‌رامبه‌ر ژنه‌كه چی‌ده‌كا ••• نیازی چی‌یه •• له‌به‌رئه‌وه ئێمه ده‌توانین بزانین به‌نیـازه چی‌بـكا •• جـا گرنگ نی‌یه داخۆ ده‌توانێ ئه‌مه بكا یان نا •• چونكه ئه‌مه شتێكی‌تر ناخاته

سەر ناوەڕۆکی فیکری چیرۆکەکەوە چونکە کارەکە وەك (فعل) لەناو مێشکدا ڕوویداوە • بەڵام لەڕووی هونەری‌یەوە دەبوو چیرۆکەکە لێرەدا بوەستێ : چونکە ئەگەر پاڵەوانەکە ئافرەتەکەی بدیتبایە ، یا ئەوەتا هەر ئەو شتانەی دەکرد کە پێشتر لـە مەیدانـی تۆڵەسەندنەوەی مێشکـی‌دا کردبوونی ، واتە هیچ شتێکی زیادە نەدەخرایە سەر چیرۆکەکە بەڵکو تـووشی دووبـارە کردنـەوە دەهـات ، یـا ئەوەتـا دەبـوو چیرۆکەکە بەلایەکی‌تردا بەرێت ، واتە چیرۆکێکی تازەی بخاتە سەر••• وەستـانی چیرۆکەکە لێرەدا ، مـەودای بۆ خوێنـەر هێشتۆتـەوە ، شی‌بـکاتەوەو هەڵسەنـگاندنێکی دروستی پاڵەوانەکە بکا •

چیـرۆك نـووس ڕووداوەکەی ـ تجریـد ـ نەکردووە • یان لـە ئاستێکی زەینی وشـك‌دا نەیهێشتۆتـەوە •• بەڵـکو توانیویەتی مەودای مرۆڤانە بـە حاڵەتـی کوڕەکە بـداو ، گـەر خۆشی پێ‌نەزانێ ، لـە چوارچێـوەی بیرکردنەوەی چینایەتـی‌و ئاسـتی ڕۆشنبیری خـۆی‌دا ، بیجوێنێ • گەرچی لەم‌لایەنـانەدا چیرۆك‌نووس هەندێ‌جـار ، درێـژەی بە هەندێ وەسف‌کردن داوە ، بەڵام بەشارەزایی‌یەوە هاوتایی‌و هارمۆنـی لایەنەکان‌و تەکنیکە جیاکانی چیرۆکەکەی ، لە چوارچێوەی ـ هۆشڕێژ ـ تیار الوعي ـدا پاراستووە •

لە چیرۆکەکەدا دوو دەنگ دەبیسین : دەنگێـك کە موخاتەبـەی پـاڵەوانەکە دەکاو ، دەنگی پاڵەوانەکە خـۆی کە لە ڕێـگای قسە لـەگەڵ خۆکردنا « مۆنۆلۆگ » حاڵەتەکان‌و بیرەوەری‌یەکان‌و نیازەکانی خـۆی لە ڕێگای فلاش باکەوە ئاشکرا دەکا •

دەتوانین بشلێین دەنگی یەکەم دەنگی چیرۆك‌نووس خۆیەتی کە ئەو دەدوێ • بەڵام بەلای منەوە وا ڕاسترە بڵێین ئەویش هەر دەنگی پاڵەوانەکە

خۆیەتی • دەنگی هوشیاری دەرەوەیەتی ، کە وەکو هوشیاری مرۆڤێکی هەست ناسك‌و حەساس ، چاودێری ناوەوەی دەکا ••• یا دەتوانین بڵێـین ئەم بەسەرهاتە ، ئەم پێداویستی‌یە تونـدو بەهێزە بـۆ تۆڵەسەندنەوە ، جۆرە دابڕینێکی لە کەسێتی پاڵەوانەکەدا درووست‌کردووە •• ئەو کە تائێستا ئەوپەڕی ئینسانی‌و مرۆڤ‌پەروەرو هێمن‌و دڵپاك بووە ، ئێستـا دەبێ بێتـە پاڵەوانی دڵڕەقترین جەنگە تۆڵـە •• بۆیـە ئەو بە زەحمـەت دەتوانێ هاوگونجانێك لەنێوان حەقیقەتی کەسێتی خۆی‌و ، مەرجـە نائینسانی‌یەکانی تۆڵەسەندنەوە پێك‌بێنێ •

چـیرۆك‌نووس گرێ‌یەکی‌تری لە کۆتـایی چیرۆکەکەدا ، بـە بـێ حەل‌کردن‌و ڕوون‌کردنەوە دروست‌کردوە : پیرێژنە ناشیرینەکەیە •• کە ڕستە هەرە بەهێزەکەی لە رووی ڕوون‌کردنەوەی ڕووداوەکانەوە خستۆتە سەرزاری ئەو پیرێژنە •

[ پیرێژنێکی دزێوی خاوەن ڕوویەکی پڕ چرچ‌ولۆچ کە لە پیریژنـە جادووگەرەکانی چیرۆکەکانی « شکسپیر » دەچێت ؟!••]

ئایا بۆیە وا بە ناشیرینی پێشکەش کردووە ، تا ئەو ڕستە ناشیرینـە بە زمانی ئەوەوە بڵێ ؟•••

ئایا رقی ئـەم پیرێژنـە بێ‌دەم‌ودانـە لە نەسرین خان ، لایەنێـکی حەسوودی ، نێوان خێزانە بۆرژواکان نیشان‌دەدا ؟!

ئایا مەبەستی چیرۆك‌نووس ئەوەیە ، گرێی دەروونی ئەو پیرێژنـە هیوا بە ژیان نەماوە ، لە ڕێگای ڕقی ڕەشی ئەو بەرامبەر نەسرین خانـی جوان‌و دەوڵەمەند ، نیشان بدا ؟!

× × ×

گرێیەکیتر : کە چیرۆکنووس بە داخـراوی هێشتویەتەوە ، مەسەلەی گوازتنەوەی ماڵێ نەسرین خانە بۆ کۆشکێکیتر ؟! دیارە لێرەدا مەبەستە سەرەکییەکە گرنگە کە نیشاندانی دەوری سامانو دەوڵەمەندیی‌یە لە ژیانی نەسرین خاندا . دەسەڵاتی ئەوان لە کۆشك گۆڕیندا ... بەڵام ناشێ گوازتنەوەی ئەوان لەبەرئەوەش‌بێ کە مێردی ژنەکە نەیویستووە لەو خانووەدا بن ؟ لەبەر هەر هۆیەکی خێزانی بێ ! ئایا ناشێ مـێردەکەی دوای ئەوەی ژنەکە یەك ساڵ زیاترە نـاوی کوڕەکەی کردۆتە شـەکرە شیرینەی سەرزاری ، بەم حاڵەی زانیبێ‌و گومانی پەیـدا کردبێ ؟. زۆر جار وا ڕێك‌دەکەوێ کە بۆرژواکان ئەوەندەی داوێن‌پیسن ، ئەوەنـدەش دڵپیس بن ؟

## زمـانی چیرۆکەکە :

زمانی چیرۆکەکە ، زمانێکی شیعریی‌یە .. ئێمە لەم مەسەلە نادوێین کە ئایا زمانی شیعر بۆ چیرۆك باشە یان نا .؟ چونکە بە لای منەوە ئەم باسە وەك مەسەلەیەکی سەربەخۆ لێدوانی پێویست نیە .. چونکە زمانیش بەشێکە بەڵکو گرنگتر بەشـە لـە ئوسـلوبی چـیرۆکنووس . گرنـگ لێرەدا گونجاندنی زمانەکەیە وەکو ئامرازێکی سەرکەوتووی دەربڕین‌و وەسف‌کردن : واتە وەکو ئامرازێـك بـۆ خزمـەت کردنـی نـاوەڕۆکی بابەتەکەو ، لەدواییشدا ، گونجاندنی شێوەو ناوەڕۆك بەیەکەوە .. گـەر سەرنج لە چیرۆکەکە بدەین دووبارە : دەبینین دەربارەی پاڵەوانێکی مرۆڤ پەروەری هەست ناسکی ، ڕۆشنبیرە ، کە دەیەوێ تۆڵەی خۆی لـە ژنێك بکانەوە کە برینێکی قووڵی خستۆتە دڵیەوە :ـ ئایا زمانی شیعر بـۆ ئەم ناوەڕۆکە دەبێ ؟! زمانی شیعر بە شێوەیەکی گشتی زمانی هەڵچوونـە ، زمانی وەسـفی نـاسك‌و دیوی ناوەوەیـە ، لێرەشـدا ، لـەم چـیرۆکەدا

هەمووشتێ لە ناوەوەدا ڕوودەدا ، بۆیە زمانەکە زمـانی شیعری‌یە ، زمـانی هەست‌و هەڵوێست‌و خەیاڵی ڕۆمانسیانەی پاڵەوانەکەیەو زمانی خەم‌و خەیاڵ‌و یادگارو تووڕەیی‌و ڕق‌و کینـەو ئـارەزووی تۆڵـەو تـرس‌و شـــەرم‌و شکاندنەوەیە ••• بۆیە دەتوانم بڵێم زمانەکە نەك تەنها گونجاوە بۆ ئـەم بابەتـە بەڵـکو بۆتـە هۆیەکـی جەوهـەری لە سـەرکەوتنی هونەری چیرۆکەکەدا ••• هەر ئەم زمانە شیعری‌یەیە وای کردووە هەندێ ــ وردو مەزنی ــ تفاصیل ــ زیان بە بنیاتی چیرۆکەکە نەگەیەنن‌و خۆینەریش بە ئارەزووەوە بیخوێنێتەوە ••

وابزانم نموونەی جوان‌و سەرکەوتووی وێنەو وەسفی شـیعری لـە چیرۆکەکەدا هێندە ئاشکران کە پێویست بە نموونە هێنانەوە ناکات •

## ئەنجـام :

کاك شیرزاد حەسەن لە ڕێگای هەڵبژاردنی پاڵەوانێکی ڕۆشنبیری شـەرقی ــ وردە بۆرژوازی خـاوەن پیشینەیـەکی هـەژار ، توانیویەتـی نموونەیەکی سەرکەوتووانەو واقیعی ئەو جۆرە ڕۆشنبیرانەمان نیشان‌دا ، کە لە مەیدانی زۆرانبازی‌و گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی‌دا ، لە هەڵوێستی ذاتی‌و بەرژەوەندی یەك‌لایەنی خۆیانەوە سەیری ڕووداوەکان دەکەن ••• چیرۆك‌نووس هاتووە زیرەکانە حـاڵەتە ئینسانییەکانی ئەو پاڵەوانەی بـە مـەرج‌و پێشینـە کۆمەڵایـەتی‌و چینـایەتی‌یەکانەوە گـرێ‌داوەو بەمـە ڕووداوەکانی لە مـەودا فـراوان‌و بەرینـەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی‌دا جووڵاندوون‌و ، لە ئەنجامدا ، ئەو ڕاستی‌یەی دەرخستووە کە بـارو دۆخی کۆمەڵایەتی‌و واقیعی جیـاوازی چینایەتی هەمیشە لە خـەون‌و خواسـتە تاکەکەسی‌یەکان بەهێزترە ••• دیارە دروست نیـە ، وا بیربـکەینەوە ، کە بیرکردنەوەی پاڵەوانەکە ، کت‌ومت ، بیرکردنەوەی چیرۆك‌نـووس

خۆیەتی •• شێرزاد لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا ، نموونەی جیاوازی ئەو کەسانەی ناو کۆمەڵ وەردەگرێ کە سەرنجی ڕادەکێشن و خاوەن کێشەو گیروگرفتێکی وان کە پێیەوە دەتلێنەوە ••• ئینجا وەکو چیرۆکنووسێکی شارەزا ، هەڵس و کەوت لەگەڵ ناوەوەی پاڵەوانەکانی دەکا •• بەڵام دیارە حاڵەتە زاتی‌یەکان ، زۆر بەهێزترو دەوڵەمەندترو ، لە ژیانەوە نزیکتر دەبن ، کاێ وەك لەم چیرۆکەدا دەبینن ، حاڵەتە ئینسانی‌یەکان تەنها لە سنووری دایلەکتیکی بیرکردنەوەی ناوەوەی پاڵەواندا ناخرێنە ڕوو ؛ بەڵکو لە دایلەکتیکی ژیاندا وەردەگیرێن : دایلەکتیکی زات و مەوزوع ، دیارە ڕوانین بۆ هەر بابەتێك لەم ڕوانگەوە ، مەسەلەیەکی قووڵەو ڕەنگە هەویرەکە وا لێ بکا ، ئاوی ڕۆمانێك بکێشێ ، نەك کورتە چیرۆکێك • بەڵام لە سنووری کورتە چیرۆکدا ، چیرۆکنووس توانیویەتی مافی خۆی بەڕووداوەکە بدات •

# کورتە شیعر

حەسیب قەرەداخي

(١

لە نێرینەی رووبارێکی دڕندەدا ، گوڵێك ڕووا ٠٠
سەرکەوت ، سەرکەوت
تا گەیشتە دەم ڕەشەبا ٠٠ ،
هێنای بردی ، بردی هێنای
شکایەوە ٠
شەپۆلێ هات هەڵی گرت و
لەوبەرەوە ، لە دامێنێ چیایەکدا ، ڕووایەوە ٠

١٩٧٩/١٠/١٤

(٢

رووبارێك هـات ٠٠٠
چهاتنێك ، قوڕەسوور بوو !

لەولایشەوە ...
چەمێکی ڕوون ، هێدی هێدی ...
گەردنی خۆی بۆ سایەقە رووتکردبوو ،
لای کردەوە ، قوڕاوی سوور
هەتا بەر مەمكو سینگی هات ، .
وەك منالێ ئاگری تێ چی ،
بەرەوکۆشی دایکی هەڵات !

١٩٧٩/١٠/١٤

٣)

مەلێك لەسەر پۆپەی دارێك ، بای باڵی دا
من ، نەمزانی . مێ بوو ، نێر بوو .
بەڵام هەر کە کەوتە خوێندن
هەڵنەفڕی هەتا تێر بوو .

١٩٧٩/١٠/١٥

٤)

وڵاتێك بوو لە وڵاتان
جەژنی سەربەخۆیی‌یان بوو ،
نمایشیکیان پێکهێنا ،
شانو کەمەر
ناو شارو دەر
پڕ بوو لە چەك

پیرەمێردێ ، وتی خۆزگە ، سەد خۆزگایە
لەبریتی هەر فیشەکێ ، کێشی هەموو ئەم ئاسنە
چەپکی گوڵە گەنم بوایە ٠

١٩٧٩/١٠/١٧

٥)

شاعیرێك‌و دایکێکی کورد ،
بەیەکەوە ژان‌گرتنی
ئەو شیعرێك‌و ئەم کوڕێکی بزێوی بوو ٠
دوای هەژدە ساڵ ٠٠ ،
لە سەنگەرێکی تازەدا ، بە سوێندەوە
کوڕە شیعرەی ئەخوێندەوە ٠

١٩٧٩/١٠/١٧

٦)

ئاسۆ ، رۆژێك بە خۆری وت :
ئەگەر مژدەی هەڵاتنت نەدەم چی‌یە ؟!
خۆریش وتی قەت ناتوانی ،
ئەگەر مژدەی بەیان نەبێ ،
ئاسۆ نی‌یە !

١٩٧٩/١٠/١٧

(٧

کچێك ـ وتیان ، وایەو وایە !
سەری هەڵگرت
ـ زۆر تەواوە ، وا ڕەدوویش کەوت ..
دوو شەوو ڕۆژ کەس نەسرەوت
دۆزیانەوە ، خۆی کوشتبوو ...
ڕووسووریی خۆی جێهێشتبوو .

١٩٧٩/١٠/٢١

(٨

لە ئەفریقا
قوڵەرەشێك درابووە بەر
قامچی ، داخی پشتی ئەکرا ،
نووچێکی دا
دەسی لە بنچکێك گیر بوو
وەك مار دای بە پەنجەیەوە
هاواری کرد : بۆچی دایکی نیشتمانم ؟!
ـ چونکە پیاوێ وەکوو تۆ بێو
ڕانەپەڕێ
بە نەوەی خومی نازانم .

١٩٧٩/١٠/٢١

(٩

شیعرێك لەگەڵ سەربەستیدا
لە وەرزێکدا گەیشتنە یەك
شیعر بوو بە بەستەو ئاواز ،
سەربەستی بە گیانێکی شاد
(مەرگەوەڕێ) کەوتە نێوان ،
سەربەستی مرد ،
شیعریش بوو بە شینو شەپۆڕ ،
بە قوڕ پێوان ٠

١٩٧٩/١٠/٢٣

(١٠

لە شارێکدا ٠٠٠
ئافرەتێکی (داوێن پیس)یان ، سەربڕیبوو
کە بۆ تۆماری (حادثە) وێنەیان گرت ،
جێگە پەنجەو لێوی گەرمی ٠٠٠
پیاوماقووڵانی شار ، مابوو ٠٠٠
لەسەر رانو سینەی نەرمی !

١٩٧٩/١٠/٢٣

(١١

ساڵ بەو عەیام ٠٠٠
شاعیرێك بوو ، ویستیان بیکڕن

هەر خۆی نەدا بەدەستەوە
لە نێرینەی شەوەزەنگی شاری کپا
پلە پلە هەموو لەشیان ، بە شیپی قامچی بەستەوە ·،
بەر لە بەیان ،
شیعرێك لەناو دەروونیەوە ،
خۆی هەڵبڕی تا سەرشانی
خوێندی ·· خوێندی هەتا توانی
لە دڵۆپێ خوێن بەولاوە ،
کەس بەم ئازارەی نەزانی ! ··

١٩٧٩/١٠/٣٠

(١٢

عارەقخۆرێك ···
پەیتا پەیتا ، پێکی خەستی خۆی هەڵئەدا
هەرچی سەگی جوێنی دڕ بوو ، لە سەردەمو
لە ژیانی نوێی بەرئەدا ·
وتم بۆچی، بۆ سەرخۆشی، ئا بەمجۆرە بشکێیتەوە؟!
وتی جەناب تۆ نازانی قفڵە کوێرەی ئەم ژیانە ،
بە کلیلی ئەم زووخاوەیش ناکرێتەوە ·

١٩٧٩/١١/٤

(١٣

ڕۆژێك ترسێك لەلاوە هات
وەك مۆتەکە ،

خۆی دا بەسەر دڵو سەرما
تەقی‌یەوە بەناو لەشو ناودەمارو خوێنی گەرما
کە هۆشێکم پیا هاتەوە ، لێی‌ڕاپەریم ،
خەرێك بوو دڵ بکاتەوە ...
هەرچی نەختینەی بڕوام بوو ،
ئەیویست هەمووی بخواتەوە .

١٩٧٩/١١/١٤

(١٤

پەڵە گەنمی سینەو مەمکی کچێکم دی ،
ئاوەنیا بوو ...
خشت هەڵچووبوو ، گوڵێکی لێ نەشکابووەوە
هەر کە واقی وڕمی بینی ، دوگمەکانی دا بەیەکاو ،
دوورکەوتەوە
بەڵام کارژۆڵەی چاوی من
وەکوو شەماڵ
کەروێشکەی خستە سینەی قاڵ .

١٩٨٠/٣/٣٠

(١٥

ئێوارەیەکی پاش باران ،
ئاسکە زێڕینە دای لە شاخ ،

خونچـه گوڵێك ئەشنایەوە ،
هەرچی تیشکە ختووکەی دا
ئێستاو ئەوسایش نەکرایەوە !٠٠ ،
ڕۆژ تووڕە بوو ، شەوی هێنا ،
بۆ سبەینێ هەڵهاتەوە ،
وتی گەردوون ئا ئەو خونچە لە پێشوازی بەیانمدا
بۆچی دەمی ناکاتەوە ؟!٠٠٠
وتی ، چونکە بەوەفایە ٠٠؟
دڵۆپێ ئەشکی ناکامی ڕێبوارێکی جوانەمەرگی
لە دڵدایە ٠

١٩٨٠/٣/٣٠

(١٦

خەبەرێکی لە ناکاتدا ، دەروونمی هێنایە کوڵ ،
جۆشا ، جۆشا
ڕێگەم بڕی ، شاران گەڕام ،
سەرم کرد بە دەیان کۆشا
زەوی هەمووی هەڵگەڕاوەو
بوو بە باری پشتو شانم
هەرچی ئەشكو ئاهم هەبوو
بە دوو سێ قوڵپێ ڕژانم ،
دەستم دایە بەر ئەژنۆمو خۆم خواردەوە ،
هەرچی خەمی قورسم هەبوو

لەولامەوە ئەمشاردەوە ٠
تەنها خەمی ئەو خەبەرە ٠٠٠
ئەیدا لە دەرگای گیانمو
ئەیوت : رێگە هەر خەتەرە ٠

١٩٨٠/٤/٣٠

× × ×

**ڕەئووف بێگەرد**

کە لە دوا پێچی کۆڵانە تەنگەبەرەکە ترازا ، لەسەر شۆستەکە هەڵوێستەیەکی کرد ، یەك دوو جار پێی بە زەویدا کێشا ، خــۆلی سەر پێڵاوەکانی تەکاند ، ئەوسا وەك کەروێشکی ترسـاو سەرنجێـکی پەلەی ئەملاولای خــۆی داو کەوتــە ســەر هێڵــە سپی‌یەکان • شــەقامە گشتی‌یەکەی بڕیو هەنگاوی نایە سەر شۆستەکەی ئەوبەر •

چێشتەنگاوێکی درەنــگ بوو ، خــۆر بوبووە سەرلەشکری شمشێر بەدەستو بەرەو ناوەڕاستی ئاسمــان هێرشی دەبــرد ، رووی شار داخ بوو ، تاكو تەرای سێبەری کەشكو چەتری ئیستگەکانیش دەتوانەوە • ئەمیش بە کەناری لای چەپی شۆستەکەدا سەرەوژوور ملی ئەنا •

« ئەم هەفتەیە هەمووی پشووم ، تازە دوو ڕۆژی تێپەڕیوە ، چواری ماوە ، چوار ! جــا چی تــەواوی دەکات ! خۆیشم نازانــم کارکردن خۆشترە یان پشوو ؟ لەو بێزارو لەم هەراسان • وادیارە هەردووکیان لای من بوونەتە یەك ، یان هەست بە هیچیان ناکەم ؟! »

لە تەنیشتەوە پرمەی پێکەنینێك هەڵیسڵەماندەوە ، لەرزی ، مستەکۆڵەیەکی قورس بوو بەر پەناگوێی کەوت ، ڕێگاکە لە بەرچاویا سووڕاو ، ڕەوتە خۆشەکەی تێك‌چوو • وەستا ، نەیزانی چۆن هەنگاوە لەرزۆکەکەی بۆپێشیەوە نایەوە • بە لایەکی چاوی ڕوانی •

دوو گەنجی سنگ‌و بەرۆك کراوەی قیت لەتەنیشتیەوە تیژ تێپەڕین ، پێکەنینەکەیان بۆ دابین نەدەکرا • ئەم ملی بەلارەوە ناو خۆی دواخست، چاوی لێ‌نەتروکاندن تا خۆیان بە گوزەرەکەدا کردو لەناو خەڵکەکەدا ون‌بوون •

بە لارە لارە سەرکەوت ، لە سەرووی فلکەکەوە لادایەکی سوور سەرنجی ڕاکێشا • شەپۆلی تیشکی خۆرەکە بریسك‌و هووڕی پێ‌خستبوو • چاو بەرگەی ڕوانینی نەدەگرت • بەسەر قیرتاوە تازەکەوە دەت‌وت پشکۆی ناو ژوورێکی تاریکە • تا نزیك دەکەوتەوە بەرەو شۆستەکەی لای ئەم لای‌دەدا ، تا بە چەند هەنگاوێك لەسەرروویەوە وەستا ،ئافرەتێکی شۆخی لێ دابەزی، کراسێکی گوڵ قەدیفەی سورو ، کەوایەکی خامەکی سەوزی لەبەرا بوو ، چمکی کەواکەی نیشتە سەر شۆستەکە • لەدوایەوە مێردە قوزەکەیشی دابەزی ، بەرەو خوار هاتن ، کە گەیشتنە بەردەمی ئەم‌و بە ڕوویا هەڵیان‌ڕوانی ، وەك تەقینەوەی نارنجۆکی نیوەشەوێکی کپ بە جووتە دایانە هاڕەی پێکەنین ، ئەم تەکانی دایە خۆی‌و هەنگاوی گورجی نا ، بەتەنیشتیاندا فڕکەی کرد • گێژ بوو ، پشکۆیەکی سوور لەناوەوەیدا دەیبرژاندو ، خۆریش زیاتر بە لەشیا دەچزا • هەستی بە ماندوبوون کرد ، دوو هێڵی ئارەق لە لاجانگیەوە تا سەر چەناگەی کشان ، لۆچە تەنکەکانی تەوێڵی بوونە دێراوی کورت‌و ئارەقەیان لێ

هەڵنیشت ، دڵۆپەکانیش لە ناوچاویەوە بە کەنار لووتیا هاتن‌و ، لە سەرووی سمێڵە زل‌و شۆڕەکەیەوە قەتیس مان •

کە گەیشتە جەمسەری شەقامەکەی تر ، بە پلیکانەکاندا هاتە خوارێ ، لەڕاستی ڕیزە عەرەبانەیەکی دەستیەوە ، بە بەردەم دووکان‌و حەمامە کۆنەکەدا هات ، لە پێچە ئاپوورەکە تێ‌پەڕی ، تەواو سەری دانەواندبوو ، لە یەکەم کۆگای بەردەم قەیسەریەکە لایدا ، ویستی لای کۆنە هاوڕێکەی پشوویەك بدات • دەسڕەکەی دەرهێنا ، سەرو ڕووی سڕی • لەپێش جامخانەکەدا وەستاو سڵاوی کرد • لە چاوی هاوڕێکەی وورد بووەوە • بێ‌دەنگیەکی سەیری بینی ، چاوی هاوڕێکەی وەك دوو گڕ بڵێسەیان دەسەند ، تا لەبڕا رووی لێ وەرگێڕا ، پشتی لەم کردو دەستی گەیاندە شت‌ومەکی سەر ڕەفەکان ، وەك بیەوێت خۆی لێ بدزێتەوە • ئەم هەر چاوی تێ بڕی‌بوو ، لەدواوە بەسەرو پشتیا هەڵیدەڕوانی ، هەستی کرد لەشی هاوڕێکەی کەوتە لەرزین ، شان‌و سەری بوونە ئیسفەنجی ناودەست، دەچوونە یەك‌و دەکرانەوە، پێکەنینەکەی تا ئەهات گەرمتر ئەبوو ، چاوی ئەم لەنێوان ڕاستی‌و گوماندا هەڵدەسووڕا ، لەشی ئەویش وەك قورقوشم دەتوایەوەو ، بەناو چاوو برینە دەم‌کراوەکانی دەروونی ئەمدا ڕۆدەچوون • کە ئاوڕی دایەوەو ئەمی بینی ، وەك بەری رووبارێکی پەنگ‌خواردوت بەردابێتەوە ، لافاوی پێکەنینەکەی زیاتر هێرشی هێنا ، ئەم نەیزانی چی‌بکات : ئەوە نەبێت بە بێدەنگی لە بەرزایی پێش کۆگاکەوە هاتە خوارێ ، دەسڕەکەی بە لامل‌و سەرو چاویدا هێنایەوە ، بەرەو ناوجەرگەی قەیسەریەکی ملی‌نا • خەڵکەکە پوورەی هەنگ بوون ، پێکدا دەهاتن‌و دەچوون • زۆر بە گران هەنگاوی بۆ دەنرا ، نەی‌دەزانی لەکوێدا پێ‌دادەنێت‌و چۆنیش هەڵیان‌دەگرێت • زۆر چاو لێ‌یان دەڕوانی ، چاوی ئەمیش تەنیا بە دوو

پارچە گۆشتی سەر بۆشاییەکەوە دەگیرسانـەوە کـەی دەکرێنەوەو کـەی دادەخرێن ، بەڵام لە بەختی ئەم کە دەکرانەوە داخرانیان نـەبوو • بـە خۆی وت :

« لە تاقە درەختێکی پیر دەچم لە بیابانێکی وشكو گەرما ، زەوی ئاوی لێ بڕیوەو ، رەشەبایش بە هەموولایەکدا دەمهەژێنێت ، نامۆم ، هەست دەکەم بەم خاكو خەڵکە نامۆم ، جا چۆن هەست نەکەم !» •

گەیشتە پێش دەرگای ئەوسەری قەیسەریـەکە ، بـە پلیکانەکانیـدا سەرکەوت ، لە ڕووکاری ئەودیودا بە دەستی چەپیا لایدا ، لـۆژ لـۆژ بە بـەردەم سـەوزەفرۆشەکانـدا هـاتە خـوارێ • لـە بەرانبەریـەوە هاوڕێیەکی تری منداڵی بینی ، کەمێك گەشایەوە ، رۆژانێکی هاتەوە یاد پڕ لە خۆشەویستیو سادەیی بوو ، هەناسەی بەکوڵی بۆ هەڵکێشا ، سەری داخستو بە خۆی وت :

« سەرم لە ئاسمان بڵندتر بوو ، خۆزگا گەورەییش منداڵی بوایە ، ئای •• فەرهاد •• کۆنە هاورێی منداڵیو قوتابخانەم ، بۆ کوێ بچیـت لەگەڵتا دێم ، ناتوانم لەمە زیاتر بەتەنیـا برۆم ، لەمکاتانـەدا پێویستم بـە دڵنەواییەکی بچووکە ، کە مرۆڤ وای بەسەر هاتو تێكشکا ، چاوەڕێی دەسـتو دوانـی هەمـوو کەسـێکە ، حەزدەکەم هەمـوو یادگارەکانـم بگێڕمەوە ، ئەمەوێت لە سووچێکدا سکاڵای خۆمت بۆ بکەم ، ئەزانیت ئەو سکاڵایەش چەندە ئاسوودەییم دەداتێ ؟ » •

سەری بەرزکردەوە ، وایزانی فەرهاد گەیشتۆتە بەردەمی ، کەچی وەك تینوویەك بەدوای تراویلکەدا وێڵبێت وڕ بوو ، لە شوێنی خۆیـدا چەقیو بەتاسەوە چوو ، لەبەرخۆیـەوە وتی : « هـەرگیز بڕوا نـاکەم

نەی‌دیبم ، ماوەمان هەر حەوت هەشت هەنگاوێك بوو ، ئەشێ ئەویش ... ؟! » .

بەپەلە خۆی بەناو گوزەرە تەنگەبەرەکەدا کرد ، ویستی هەرچۆنێك بێت بیگاتێ . پاڵەپەستۆی خەڵکەکە هێرشی هێنا ، ئەم گوێی نەدایە ، سنگی پێوەناو گەیشتە ئەوسەری شەقامەکە . مەبەستی نەبوو لەوانە وردبێتەوە پێ‌دەکەنین ، یان هەر هەستی پێ نەدەکردن .

کۆڵانە باریکەکە ، کە سێ ڕێگای دەهاتە سەرو ، ئەچووەوە ناو ڕاستە بازاڕەکە ، وەستانی ، نەی‌زانی ڕوو لە کامیان بکات ، کەلێك بەملاولایدا هەڵیروانی ، بە هەرسێکیاندا چاوی خشاند ، پاشانیش بۆ ئەوسەری شەقامە گشتی‌یەکە ، بەڵام تارماییشی بەدی نەکرد ، ناچار سەری داخستەوە ، بەرەودوا گەڕایەوە ، بە ڕێگا کۆنەکەیدا گەیشتەوە سەر شۆستەکە . پڕمەیەکی تازە ، ڕای پەڕاندەوە ، پیاوێکی کورتەبنەی سەرو ڕیش سپی بوو ، هێشتا چاوی لێ کەلا نەخستبوو کە منداڵێکی دە ساڵان‌و پیرەژنێك بەرەوڕووی هاتن ، بە جووتە دایانە قاقای پێکەنین . ئەم کاس بوو ، پێکەنین لە هەموو لایەکیەوە بووە لوورەی ڕەشەبا . هەستی‌کرد هیچ نەماوە پێی پێ‌نەکەنێت ، تەنانەت شەقام‌و هەوایش . هەنگاوی فراوانتر کرد ، هاتەوە بەر کۆڵانە تەنگەبەرەکە ، بەپەلە پێچەکانی بڕی ، گەیشتەوە بەردەرگاو خۆی بە ژوورێدا کرد .

× × ×

کە دەستە ساردەکە کەوتە سەر تەوێڵی ، چاوی کردەوە ، ئەمیش دەستی ڕاستی بەرزکردەوەو ، خستی‌یە سەر دەستی ژنەکەی ، زیاتر قورسایی نایە سەر ، کەمێك هەستی بە خاوبوونەوەی لەشی کرد ، بەڵام مێشکی هەر دەکوڵاو ، ناوچاوی بروسکەی دەدا . لە چاوی سوور

داگەڕاوو پێڵوی شێواوی ژنەکەیدا ، گەلێك پرسیارو نهێـنی بینیـەوە ، نەی‌توانی زۆر تێی بڕوانێت ، چاوی داخستەوە ، لەسەرخۆ پێی‌وت :

ــ منداڵەکان لەکوێن ، بۆ دەنگیان نایەت ؟

ــ هەردووکیان لە کۆڵان یاری دەکەن .

بە قووڵی تەماشای ژنەکەی کردەوە ، یەکەمجاری بوو قژە ڕەش‌و درێژەکەی کردبوونە پەلـك‌و ، بەسـەر مەمکیـا هاتبوونـە خـوارێ ، جلەڕەشەکانی لێ بووە نەخش ، بە ماتەمیەوە پێی‌وت :

ــ کە تۆ بەم‌شێوەیە دەبینم زیاتر هەست بە غەریبی دەکەم .

ــ غەریبی ؟ بۆ ؟

ــ نازانم ، تەنیا ئەوەندیە لە هەمووشت دابراوم ، تەنـانەت تـۆیش‌و منداڵەکانیشم . بوومەتە ئەو گۆمەی ئاوی ناچێتەسەر . تا بێت زیاتر بۆگەن دەکەم .

ــ ئەی تۆ ئەزانیت چۆن خەوتبوویت ؟
لێوی بەدەما برد ، ئەی‌زانی چی‌کردووە ، بەڵام بۆ زیاتر لـە خۆگەیشتن وتی :

ــ چـۆن ؟

ــ چۆن ! ناچـار دەرگاکەم لەسـەر داخستیـت ، وڕینـەو هـاوارت دەگەیشتەدەرێ ، نازانم تۆ ئەمە ماوەیەکە تەواو گۆڕاویت .

« نای‌زانیت ، ئەزانم کە نایزانیت ، بەڵام زۆر نابات ئەی‌بیستیت . ئەوسا وا هەست‌دەکەیت کوڕو کچەکەت لـە گورگن ، ئـا .. چونـکە باوکیان ..» .

— ئـاخ •• مێشکم خەریکە ئەتەقێت •

تەکانی دایە خۆی ، بەتانیەکەی داکێشایە سەر ئەژنۆی ، دانیشت ، سەیری لووتی قۆندەرەکانی کرد ، وەك رەش‌مار لە دامێنی بەتانیەکەوە لووتیان دەرهێنابووەدەرێ ، بە جلەکانیا هەڵپروانی کە پێیانەوە نووستبوو • شەرم دایگرت • بە تەکانێکی‌تر هەستایە سەرپێ‌و لە ژوورەکە هاتەدەرێ ، ڕاڕەوەکەی بڕی ، گەیشتە ناو حەوشەکە ، بە پلیکانەکاندا چووە بەر هەیوانەکەی‌تر ، لە پەنجەرەکەوە کاکی بینی ، لەسەر کورسی‌یەك دانیشتبوو • چووە ژوورێ‌و بەرانبەری دانیشت •

ئەو سەیری شپرزەیی ئەمی کرد ، چاوە لێڵەکانی بینی ، ئەمیش زۆر بەتیژی سەرنجی لەو دا ، لەسەریەوە بەرەو خوار • قژە سپی‌و خاوەکەی ، تەوێڵی پان ، برۆی تەنك‌و درێژ ، چاوی شین‌و پێڵووی کورت ، لووتی رۆمانی ، سمێڵی قەیتانی‌و ماش‌و برنج ، •• ها •• وا گەیشتە سەر دوو پارچە گۆشتەکە ، ئەوانەی دەرگای بۆشاییەکەیان گرتووە ، لەوێدا چاوی ڕیشکەو پێشکەی کرد ، هەستی کرد کاکی لە ناوەوەدا خۆی دەخوانەوە ، وا گەیشتە سەر لێوی‌و دایە پرمەی پێکەنین، لچ‌و لێوی لێك‌ڕەوینەوە ، ئەوەندە کرانەوە سیمای دەم‌و چاوی تێك‌چوو، هەردوو دەستی بەسەر ئەم‌لاو لای کورسیە نایلۆنەکەدا شۆڕبووەوە ، خۆی نوشتاندەوەو دەستی بە سکیەوە گرت ، پێکەنینەکەی وەك کابرای خاوەن کۆگا بەکوڵ بوو ، ئەم چاوی لێ نەئەتروکاند • ڕاما ، بە خۆی وت : « تەنانەت برایش ، برای گەورەیش ؟! »

وەك شێت ڕاپەڕی ، دەستی دایە یەخەی‌و ڕای‌تەکاند ، بەسەریا نەڕاندی ،

— تۆیش ••• تۆیش پێم پێ‌دەکەنیت ؟

کاکی لە شوێنی خۆیدا هێمن دانیشتبوو ، بەدەستیەوە بوبوە گەڵای دەم ڕەشەبا ، لەسەرخۆ پێی‌وت :

— دانیشە •• حەسەن •• تۆ نەخۆشیت •

کە گوێی لە ناوی خۆی بوو خاوبووەوە ، دەستی لە یەخەی کردەوە ، لەشە نوشتاوەکەی بڵند کرد ، چاوی کەلا خست ، تارمایی بەسەرا هات • تەریق بووەوە ، گەنە ئارەقێك کەوتە سەر لەشی ، پاشەو پاش بۆ سەر کورسی‌یەکەی گەڕایەوە ، دانیشت‌و سەری داخست • بێدەنگیەکی کڕ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا ، پاشان وەك بکرۆزێتەوە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە بە کاکی وت :

— لێم ببوورە ، ڕاستە نەخۆشم •

— نابێت هەر وابمێنێتەوە •• وا نی‌یە ؟

سەری دانەواند ، هەستاو هاتەوەدەرێ ، خۆی بە ژوورەکەیدا کردەوە • لە هەمان جێگای پێشووی داکەوتەوەو ، بەتانیەکەی بەسەر خۆیدا کێشایەوە •

× × ×

— تۆیش پێدەکەنیت ؟

پزیشکەکە بەدەم بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە :

— تۆیش ! بابەتە نەخۆشی‌یەکی سەیرە ، پەتایە •

— وادیارە کەسی‌تری وەك منت هاتۆتەلا ؟

— زۆر ••

— چارت کردوون ؟

— چار •• ! ئەگەر بەڕاستی بەسەرهاتەکەیان بۆ گێرابێتمەوە •

— بەسەرهاتی چی ؟
— ئەوەی بۆتە هۆی نەخۆشیەکەیان •
— ئەم نەخۆشی‌یە نە لە سەرماو گەرماو ، نە لە خواردنەوە نیە ، ئیتر باسی چی ؟
— بـا ••
— من گومان لە خۆم ناکەم •
— تۆ شتێك دەشاریتەوە بە ناوچاوتەوە دیارە •

ـ حەسەن ـ بێ‌ئەوەی هەست بە خۆی بکات ، دەستی بۆ تەوێڵی برد ، کە گێرایەوە پەشۆکا ، سەرنجی‌دا ، وای‌زانی رەشیەك بـە نـاو لەپیەوەیەتی • بەڵام زوو بۆئەوەی پەشۆکاویـەکەی بشارێتـەوە ، بـە تەوسێکەوەو لە پزیشکەکەی پرسی :

— ئەمانەی تۆ باسیان دەکەیت چپەیوەندیان بە نەخۆشی منەوە نی‌یـە •
— زۆر •• پاشان تێ‌دەگەیت •
— بەڵام ژیانی من ئاساییە ، خواردن‌و خەوتن‌و کارکردن ، وەك تۆ •
— چی‌تر ؟
— هیـچ •
— پزیشکەکە لەسەر کورسی‌یەکەی هەستـا ، کەوتـە پیـاسەی نـاو ژوورەکەی ، جگەرەیەکی بۆ خۆی داگیرساندو یەکێکی‌تر بـۆ حەسەن ، شانی دادایە سەر پەنجەرە کراوەکە ، کە دووکـەڵی یەکەم مژی بە هەوادا پادا پێ‌ی‌وت :

— ئێ •• چی‌تر ؟
— تۆ شەڕی دەروونیم لەگەڵ دەکەیت ، من تێت‌ناگەم •
— ئەزانیت چەندت پێ‌خۆشە بەراستی بۆم بگێریتەوە ، پاشان هەست

بە ئاسوودەیی دەروونت دەکەیت ، کەچی لەسەر ئەم پێداگرتنەت سووری ، خەریکە بەڕاستی پێت پێبکەنم ، من نالێم لە ناوچاوتا دیـارە .

ـ حەسەن ـ دەستی هەڵبڕیەوە ، تا ئاستی دەم و لووتی هێنای ، ویستی بیهێنێتەوە بە ناوچاویا ، بەڵام زوو فریا کەوت و دایگرتەوە .

پزیشکەکە بە پێکەنینەوە پێی وت :

ــ من مەبەستم نییە ، ئەگەر خۆت ناتەوێت چارت بکرێت .

ـ حەسەن ـ سەری داخستبوو ، دیسـان دڵـۆپە ئـارەقەکان لـە ناوچاویەوە بەرەو خوار کشان ، کەوتنە سەر پێڵوو چەناگەی .

دەستی بەسەر نایلۆنی کورسی‌یەکەی ژێریدا دەهێنا ، پێچەکانـی دەژمارد ، مت بوو ، ژوورەکە بووە کەندەڵانێـکی گەورەو بێدەنـگی تیا ڕاکشا ، هەریەکەیان چاوەڕوانی ئەوی‌تری دەکرد پـەردە لەسـەر کپی‌یەکە لابدات ، تا ـ حەسەن ـ سەری بەرز کردەوە ، ڕووە ئـارەق لێ هەڵنیشتووەکەی تێکرد ، چاوە لێڵەکانی تێبڕی ، بەدەم بۆچڕووکی هەناسە گەرمەکەیەوە وتی :

ــ بەزۆر بوو ... سەریان کردە سەرم ، منیش ...

ــ هە ... زۆر ؟!

چاوەڕوانی‌تری پزیشکەکەی نەکرد ، نەیشی‌توانی زیاتر بدوێت . لە جیگاکەی هەستا ، وەك تازە لە هەورازێکی سەختی دابێت ، کەوتبووە هەناسـەبڕکێ ، ڕەنگی ڕەش داگەڕابوو ، دڵـۆپە ئـارەقەکانیش بێبەزەیی بەلاملیا ڕۆدەچوون ، ئاگریان لە سنگ و بەرۆکی بەردەدا .

لەگەڵ یەکەم هەنگاوا هێڵنجێکی قورسی دا ، تا بەردەم ژوورەکەی

گردە ڕشانەوە ، بۆگەنی ڕشانەوەکە لە زێرابێکی دەکرد تازە سەریت هەڵدابێتەوە • بە شەرمەزاریەوە ڕووی لە پزیشکەکە کرد ، وەك داوای لێبووردنی لێ بکات • ئەویش بێ ئەوەی سەر لە مێزەکەی بەردەمی هەڵبڕێت پێی ووت :

ــ فەڕاشەکەی بەردەرگایش وەك تۆ وایە ، کە چوویتە دەرەوە پێی بڵێ بێت ئێرە پاك بکاتەوە •

**کانوونی یەکەمی ١٩٧٩**

# گۆستەوەرا

**شێرکۆ بێکەس**

ئەی گۆڕ هەڵکەن ! ئێستەش هەر ئازاری ئەدەی ؟!
کە دوا تەلەبەردی داناو یەکەم خاکەنازە گڵی ،
هەڵدایە سەر چاوەکانی
گوڵە گەنم •• فرمێسکی سپی‌ی هەڵرشتو ،
ئەو چنارەی دڵمان لەسەر هەڵکۆڵیبوو
پڕ بە دەمی هەزارەها گەڵای وەریو •• زریکانی •
کە ناشتیانی
لە ژوور سەرت ڕاوەستابووم
« با » لە لانکەی تەمێکی ئەرخەوانیدا
بە هەر دوو دەست تەرمەکەتی ڕائەژەنی
ستوونێك بووم لەو دارستانی ئەوینەی
دەوریان دابووی
— با چراکە هەر داگیرسێ‌و فووی لێ نەکەین •
ئەم چرایە لە دوورەوە

ئەستێرەی هیوا پرژێنەو •• ئەمانبینێ
با چراکە هەر داگیرسێو نیشانە بێ بۆ گۆڕەکەی !

— باخەکەمان •• ناناسمەوە
گوڵە هێرۆی ڕەش هەڵگەڕاو ،
ملی کەچی خستۆتە سەر شانی دایکێ
ئەگریجەکانی ئاڵاون لە تووتڕکێو ،
بەری نادەن !
ئەگریجەکانی ئاڵاون ،
لە چەند کێلێکی ناودڵیو سەما ئەکات •

— شانۆی خەڵووز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەکات :

— تەنیا باڵندەیەك مابێت هەر قاژووە
چاوتان لێیە ئەوەتا وا باڵەکانی
لەو پەڵە هەورانە ئەسوێ •• هێشتا سپین
ئەوەتا وا دەنووك لەو پەنجانە ئەگرێ
کە تائیستە نەبوونەتە کۆڵەوژی پێریژنە دۆزەخی یەکە !

— شانۆی خەڵووز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەکات
گەرووی دەربەند
تا تەنگتر بێت
« با » لەناویا
تیژتر ئەڕوات و هەڵ ئەکات !
کە ناشتیانی ، لە ژوور سەرتا ڕۆژژمێری زەردەپەڕم
ئەخوێندەوە
چۆن لێم ون بووی ؟!

ئەوسا هاتی‌و دەستی پرسیارەکەت گرتم
بە ڕێ‌وبانی تەمی ئاڵدا .. ئەتبردمەوە
دەنگی خۆمت ئەدایەوە بە گوێ‌ی خۆمدا
ئەتبردمەوە :
« ناتوانم لێت جیا بمەوە .. ئەمە عەشقەو
سەر بە گیانی سووتاوی شیعرم هەڵئەگرێ
لەناو ئەودا .. ئەتوێمەوە
لە توانەوەمدا .. پێت‌ئەگەم
ئەبارێم‌و پەلە لەناو ڕۆحتا ئەدەم
ئەمە عەشقەو من ماچی خوا ،
بە لێوی مەرگی خۆم ئەکەم
ناتوانم لێت جیا بمەوە ! »
هەردەکانم خستە بن هەنگڵی ژانم سەرکەوتم‌و درەختەکان
لەبەردەما گڕی عەشقیان لە خۆیان‌و چەم بەرئەدا
ئاو بوو بە نووروو بە دیدەی « مەولەوی »یەکانما هەڵڕژا
بانگی پۆلە ئەستێرەی کاروانی دوورم ئەکرد ،
ئەهاتن‌و یەك یەك ماچی ئەو ڕووبارەیان ئەکردم
کە لە تەختی ناوچەوانما ، ڕێگەی گەرمێن‌و کوێستانی ئەگرتەبەر .
ناتوانم لێت جیا بمەوە
داگیرساوم
داگیرسانم بەستۆتە پشت
بە هەر کوێ‌یەکدا ڕەت‌ئەبم
ڕووناکی‌ی ـ دائەمەزرێنم ـ

— که ڕووناکیو ڕەنگی زەردی هەزارەکان
تێکەڵ ئەبن
دوو ئاوانێ دروستئەبێ
نائومێدیی تیا ئەخنکێ !

— من بە سەردانێك نەهاتووم هەر گوڵاڵەت
لە پەرچەمی کچی تاڵۆکانم بدەم
هەر سەوزە گیاتم خۆشبوێو ،
بۆن بە هەناسەی مێخەکی کەنار گەردنتەوە بکەم !
« سەرەتا بوو .. خۆم هەڵکێشا
لە دوو ئاوانی عەشقی تۆ
کە هاتمەدەر
لەشم هێشووی سوورە گزنگی گرتبوو
لە بەستێنی گۆمەکانتا
شەپۆلم پێچایە سەرو
بیرم ، لە کام شوێنتا قووڵ بوو
شۆڕئەبۆوەو باوەشی ئەکرد بە ترسی
تووشهاتووتا »

— ئەی گۆڕهەڵکەن ! ئیستەش هەر ئازاری ئەدەی ؟!
کە ناشتیانی لە ژوور سەرت ڕاوەستابووم
باڵندەکانیش هێلانەی چەند ساڵەیان ،
تێكدایەوەو لە چاو ونبوون .

— من ئەمبینی گریان باڵی
فڕینیان بوو !

— ئێمە کۆست ناوکی ژیانی بۆ بڕیوین !

— نەء •• لەشم هێشووی سوورە گزنگی
گرتووەو ، چاو :
لە قاژوو زۆر بەرزتر
ئەفڕێو دیارە !
شانۆی خەڵوز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەکات !
گەرووی دەربەند
تا تەنگتر بێت
« با » لەناویا
تیژتر ئەڕواتو هەڵئەکات !!

× × ×

**محەمەد حەمە باقی**
**١٩٧٩ ـ ١٩٨٠**

ـ ١ ـ

دوێنێ شەو بوو ، کۆمەڵێك پەیکەری ئێسکی شەیتان
لەناو ڕووبارەکانی دۆزەخەوە دەرهاتن ،
هەریەکە شمشێرێکی بەدەستەوە گرتبوو ..
شڵەژابوون ، ئەگەڕان بەشوێن خۆشەویستیتا ،
هەموو جێیەك گەڕان بۆت ، نەکەوتیتە بەر دەستیان ..
بەڵام کاتێ زانیان وایت لەناو خوێنی منا ،
هاتن دڵمیان هەڵدڕی .. !

ـ ٢ ـ

بەرەبەیان جریوەی پۆلێ مەلی کۆچەری ، لە خەو ڕایانپەڕاندم ،
کە سەیری گزنگم کرد ، ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو ..
بیرم کەوتەوە ، دوێشەو ، تۆیان زامدار کردبوو

ـ ٣ ـ

باڵندەکان باوەشێ قژو پرچی خەنەیی هەڵکێشراویان نیشاندام
هەر کە دیم ، ناسیمەوە ..

ناسیمەوە ، ئەو قژە کێوییە ، قژی تۆ بوو ••
ناسیمەوە ، گەلێ جار ،
ماچو ، بۆنی تاڵ ، تاڵی ئەو قژەتم کردووە ••

ـ ٤ ـ

لەگەڵ باڵندەکانا ، سەرم هەڵگرت ، بۆت بگەڕێین ••
هەموو شت لەبەرچاومان ، ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو ••
ئاسمان •• زەوی •• ڕەشەبا ••
دارستان •• بەفر •• دەریا ••
هەمووی لە لێوت ئەچوون ،
ڕەنگی لێوەکانی تۆش ، لە زامی دڵم ئەچێ •• ئەی دڵە زامدارەکەم •• !
کاتێ تۆم لێ دیار نابیت ، لە ئەسپی قەرەج ئەچم ،
نازانم ڕووبکەمە کوێ !! •

ـ ٥ ـ

ئەم گەڕانەی ئێستای من ، پێچەوانەی سەراپای ،
چی ئەفسانەو ، داستانە ••
ئەمجارە تۆ «تەمووز»و «ئەدۆنیس»و «کاکە لاس»
منیش خاتوو «عەشتار»و «ئەفرۆدیت»و «خەزاڵ خان»
تۆ ئاوەدانیی گوندو ، شارانو ، ولاتانیت ••
منیش بێ تۆ ، بێ گیانو ، تاریكو ، بێ بژێویم ••
تۆ سەر هەڵئەگریو ، ئەڕۆیت •• ئەچیت بارانو گەنمو ،
گوڵی « شۆرانی » بێنیت ••
منیش لەدوات ئەگەڕێم ••

کە ئەکەومە شوێن کۆچت ،
ئەستێرەو ، رووبارو ، گوڵ ،
کار ئاسكو دڵداران ،
هەمووی بە سنگ کوتانو ، قژ ڕنین ، دوامئەکەون ..

- ٦ -

هەر چوار دەورت تەنیوم ،
سەدان ڕێگات کردۆتە سەرو ، دڵو ، چاوەوە ..
هەر چۆنێ هەنگاو بنێم ،
ڕێچکەی دڵۆپە خوێنی زامەکەی تۆ ئەبینم ..
تارماییشت ، شەپۆلو ، هێرشی پەیتا پەیتای « هۆلاکۆ »یە
بەسەرما ئەبارێنو ، قووڵاییم داگیر ئەکەن ..
داگیرکردنێکی پیرۆز ! .
ئەی داگیرکەری جوانم !
ئەی دوژمنی دڵسۆزم !

- ٧ -

ئەترسم لەم کۆچەمدا ، دەسگیرم کەن ، بمگرن ..
هەر بە پرچەکانی تۆش ، دەستو پێم ببەستنەوە

- ٨ -

لەژێر دارە بەنێکی پەلوپۆ هەڵقرچاوا ،
چاومان کەوت بە «مەولەوی» ،
دەروێش ، دەوریان لێ دابوو ..

پێیان ئەوت : خاڵۆ گیان ، دە ، سۆزێکمان بۆ بکە ، با تروسکەیەکی خوا
بە ڕۆحمانا ، رابووریێ ••
ئەویش کە سەیری هەردەی «شیروانە»و «بەمۆ»ی ئەکرد ،
بە بێ « عەنبەر خاتوون »ە ،
خوڕ ، خوڕ بەتاو ئەگریاو ، سەیری «سیروان»ی ئەکرد ،
لە ئاوێنەی شەپۆلی بەرهەتاوی سیروانا ،
عەنبەر خاتوونی ئەدی ••
دەنگی هەڵئەبڕی ، ئەیوت :
« چاوم ، کە وڵاتی تۆیە ، هەمیشە چاو لە ڕێتە ،
غەریبی بەسە ئیتر ، وەرەوە ناو چاوانم » (١)

– ٩ –

ئەسپێك ، بە پرتاو ئەهات ، گەیشتە لامان وەستا ،
هەواڵی [ خاكو خۆڵ ]و [ قەرەداخ ]ی لێ پرسین ،
نامەیەکی نیشان داین ، کردمانەوە نووسرابوو :
[ حەبیبە گیان ئەمناسی •• !
ئەزانی بۆ ئاوارەم ؟
چونکە هەتاکو ئێستا ،
بە سەرشۆڕیو کوڕنووشو ، چەپکە گوڵەوە نەچووم
بۆ پێشوازی سوڵتانێك •• !

---

(١) ئەم دێڕە شیعرە ، هی ـ مەولەوی ـ خۆیەتی ، من بۆ کێشی شیعرەکەی خۆم ، بەمجۆرە دامڕشتۆتەوە •• ئەمە دەقی شیعرەکەیە:

**مەوتەنەکەی چەم ، دایم ها نە ڕێت**
**غەریبی تا کەی ، با وە ماوای وێت**

- ١٠ -

لە ڕۆخی ڕووبارێکا ، شاعیرێکی قەرەجو ، دڵدارەکەی پێکەوە
دەست لە مل دانیشتبوون ••
کوێمان لێ بوو ، کوڕەکە ، شیعری بۆ ئەخوێندەوە
ئەیوت : گیانەکەم ، ئەگەر لیان پرسیت لەبەرچی ،
سەرتاپای شیعرەکانم ، [ کێش و سەروا ]یان نییە ،
هەمووی لەبەرئەوەیە ، شیعرەکانیشم وەك خۆم ،
حەزئەکەن ئازاد بژین •• !
کچەکەش بەوی ئەوت : ژنە فاڵچییەکەی خۆمان ، دەستی بۆ گرتمەوە ،
ئەیوت : ئەگەر ئەتەوێ ، تەمەنت وەك ڕووبار بێ ،
ئێوارانی هاوینان ، لەگەڵ دڵدارەکەتا ،
پیاسە بەو سەر شەقامە درێژانەدا بکەن ، کۆتاییان بۆ نەبێت ••

- ١١ -

گۆرانیبێژێکم دی ،
بە ئاگری گۆرانییە سپی و سەوزەکانی خۆی ،
کوڵ و کۆی دامردبوو ••
ڕووبار دەوریان لێ دابـوو ••
کفێکی ڕەنگاو ڕەنگیان ، لە گوڵە هێرۆ بۆ ئەچنی و ،
لەسەر سۆزو ئاوازی ، گۆرانییە شەیداکانی ،
سەمایان لەسەرئەکرد •• !

- ١٢ -

شەوێکیان ئەستێرەیەك ئەمەی بۆ گێڕامەوە :ـ
پاشایەکی نینۆك تیژ ، خۆی و پێنج کوڕو ، زوربەی

دەستو پێوەندەکانی ،
بۆ ڕاو چوون بۆ کوێستانێ ••
ڕۆژێك ، بۆ حەسانەوە چوونە ماڵۆچکەی شوانێ ••
کوڕە ناونجی پاشا ، کە دەستو دۆی شیرینی
کچی شوانەکەی بینی ،
داخورپاو ، گەردەلوولێك ، لەناو سنگیا هەڵیکرد ،
هەستی کرد ، ڕیشەی دڵی هەموو تاڵ ، تاڵ دەرهاتنو ،
ئاڵان لە تاقگەی نیگای چاوی کچی شوانەوە ••

– ١٣ –

کە ماڵەکەیان جێهێشت ،
بۆ شەوێ ، کوڕی پاشا ، خۆی لە باوکی دزییەوە
گەڕایەوە مـاڵی شوان ،
وەکو دوێنێ ڕێزیان گرت ، هەموو لەبەری هەستان ••
بەڵام ئەو لە بەردەمی کچەدا کوڕنووشی برد ••
کردی بە هاڕەی گریان •• !

– ١٤ –

• • • • • • • • •

• • • • • • • • •

• • • • • • • • •

• • • • • • • • •

- ١٥ -

پاشا ، بۆ رۆژی دوایی ، کەوتە سۆراخی کوڕەی ••
گەڕان •• گەڕان •• هەر گەڕان ••
سەدان گوندو ، هەوارو ، باخاتو ، کاریز گەڕان ••
کوڕە سۆراخی نەبوو ••
بەڵام لە هەموو جێیەك ،
لەناو رەزو ، دەوەنو ، تاڤگەو ، پەڵە چنارا ،
تەمێکیان ئەدی سپی ،
ئەرمایی کوڕی پاشاو ، کچی شوانیان تیا ئەدی ••
دەستی یەکیان گرتبوو ••
کوڕەکە پێی ئەوتن : لێم گەڕێن •• دە لێم گەڕێن ••
ئیتر لەدوام مەگەڕێن ••
من ، زەبری عەشقێکی پاك ،
تێکەڵ بە دارو ، بەردو ، رووباری ئێرەی کردووم •• !

- ١٦ -

پاشا دوای گەڕانەوە ، شەوان خەوی سامناكو ، ترسناکی ئەبینی ،
شەوێك ، هەڵۆیەکی دی ، بەسەر ژووری تەلارو ، باخچەکەیا ئەگەڕا ،
ئەگەڕاو ، ئەخولایەوە ••
داچڵەکی ، ترسا ، لەرزی ••
خێرا فەرمانی دەرکرد :
هەر ئێستاکە •• دەستو برد ،
هەرچی مەلو ، باڵدارە ••
مەیانهێڵن لەم شارە •• !

من کوڕە شازادە نیم ، بەڵام کە خۆشمویستیت ،
لێم نەپرسیت : کچی کێیت •• لە کام چینی کۆمەڵیت ••
هەر ئەوەندەم ئاگا بوو ، لەناو قووڵاییمەوە ••
هەستێکی فریشتەیی ، سیحر بوو ، سیحری سپی ••
سیحرێکی ئێجگار پیرۆز •• ڕایئەکێشام بۆ لای تۆ •• !
دوای ناسینی تۆ ، زانیم ، کێوی ئاگرینی عەشق ،
کە وادەی هەژانی هات ،
شەرمو سڵ ، لە کەس ناکات ••
پرسو ڕا ، بە کەس ناکات ••
ئەجمێ ، ئەهەژێ •• ئەکوڵێ ••
لەپڕ ئەتەقێتەوە •• عەشق ، وەك ئاو هەڵئەقوڵێ ••
هەڵقوڵامو ، هەڵقوڵام ••
هەڵقوڵامو ڕژامە باوەشی ئەم خاکەوە ••
ئەو ، ڕەنگی منی لێ نیشت ،
منیش ، ڕەنگی ئەوم گرت •• !
ئێستا منو ، نیشتمان •• منو خاکی نیشتمان ، هەردووکمان گەنم ڕەنگین ••
ئەو ، بەفری زۆر خۆشئەوێ ••
منیش ، پێستە سپییەکەت •• !
ئەوەی کچە پەرییانی ئەم وڵاتەی خۆشنەوێ ،
هەرگیز ، هەرگیز ، ناشتوانێ وڵاتێکی خۆش بوێ ••
من ئێستا تۆم خۆشئەوێ ، هەموو وڵاتەکانی ئەم دنیایەم خۆشئەوێ ••
ئەی وڵاتە پیرۆزو ، سپیو ، بێسنوورەکەم ••

- ١٨ -

ئەو شەوەی [ لاس ] شێرانە ، چووبووە کۆشکی پاشاوە
چەپکە گوڵی « شۆرانی » ، بۆ خاتوو « خەزاڵ » ئەچنی ،
مانگە شەوێك بوو ، رووناك ،
کەنیزەکەکانی سوڵتان ، بێدار بوون ، نەخەوتبوون ••
لە پەنجەرەکانەوە ، چاویان لە بەژن و ، باڵای
جەوهەرداری جوانی بوو ••
هەریەکەیان لە جێی خۆی ، ئاواتی ئەخواست ، رۆژێ
دڵدارێکی وایان بێ ••
یەك ، لەدوای یەك ، بە بەرگی پەری و ، رەنگاو رەنگەوە ••
هاتن ، خۆیان نیشاندا ••
بانگیان ئەکرد ، بۆ ژووری پڕ لە رووبارە ماچ و ،
ناو باوەشی پەمەیی ••
کەچی ئەو ، دڵی هەر لای ،
چاوە ئاسمانییەکانی « خەزاڵ »ی دڵداری بوو ••
نە گوڵی باخچەو ، سەراو ،
نە دڵی کەنیزەکی ناو کۆشکی سوڵتانی ویست ••
هەر ئەو شەوە ، بەپەلە گەڕایەوە •• لەو کێوە ،
چەپکێ گوڵی « شۆرانی » ،
سەرلووتکەی بێپەرژینی ، بۆ خاتوو « خەزاڵ » چنی ••

- ١٩ -

بێئەوەی کەس بتبینێ ، یا کەس هەستت پێ بکات ،
بوویت بە هەواو ، ئـۆکسجین ،

وەك ئەستێرەو ، خۆرو ، مانگ
چۆن شەوان بەنهێنی ،
لەشی رووتیان ، لە گۆمو ، دەریاکان هەڵئەکێشن ،
تۆش ، شەوان بە نهێنی ، بەژنو باڵای زراڤت ، لە رۆحم هەڵئەکێشیت ..
رۆحم ، لە باخی نەیجەی باڵای خۆت هەلئەکێشیت ..
ئەی جوانە خوشکی رۆحم ،
ئەی خەنجەرە دەبانو بریسکەدارەکەی من ،
لە کێلانە سەوزەکەت ، دەرچۆ ، وەرە دەرەوە ،
با پرشنگی سپێتیت ،
ئەم باخە تاریکانە ..
با ، روومەتی ئەم هەموو گوڵەباخە رەشانە ..
رووناك .. رووناك کاتەوە ..
نا ، بوورە گیانەکەم . با بچەقیت بە دڵی ئەم سەردەمە زوقمەدا ..
ئەمە سەردەمی کۆچو ، لە یەکتر دابرانی دەسگیرانو ، دڵدارە ..
ئەمە سەردەمی مەرگی ساواو ، مەلو ، بەهارە ..
ئەمە سەردەمی خەندەی گورگو ، دووپشكو ، مارە ..

– ٢٠ –

تاڵێك لەو قژە کێویەت ، لە شیعرەکانما جێهێشت ،
وتت : هەرکاتێ ویستت بێم بۆ لات .. دیدەنیم کەیت ،
ئەم تاڵە قژەم لەناو « زێی بادینان » هەڵکێشە ..

– ٢١ –

هەموو سبەینانێ زوو ، بە هەڵەداوان ئەچم ،
ئەو تاڵە قژەت لە زێی بادینان هەڵئەکێشم ..

« زێ » سەرتاپا گڕ ئەگرێ ••
تاشە بەردی دەربەندو ، درەختی ئەو کێوانەش
ئاگریان تێ بەرئەبێ ••
کەچی تۆ نایەیت بۆ لام ••!

— ٢٢ —

بەهار دێتو ، گوڵ ئەڕوێت ، تۆ سەرێکم لێ نادەیت !
« سێو » پێئەگات ، هەر نایەیت ••
کە « لیمۆ » زەرد بوو ، وەرە ••
لیمۆش زەرد بوو ، نەهاتیت ، کە نەخۆش کەوتم ، وەرە ••
نەخۆش کەوتم ، نەهاتیت •• کاتی گیان کێشان ، وەرە (٢) ••

— ٢٣ —

دایە گیان • ئەگەر مردم ، تاڵێك قژی یارەکەم ، بخە کفنەکەمەوە ••
لە گۆڕیشدا مەمنێژن ••
بڵێ : با فڕێمدەنە ، ناو زێی بادینانەوە ••
بەڵکو بەرە بەیانێك ، کە یارم ، لەگەڵ مانگ‌و ، پۆلە کچی گزنگا ،
هاتن مەلەی تیا بکەن ،
هیچ نەبێ •• هەر پێمخۆشە •• بە مردوویش ببینم •• !
بە مردوویش بمبینێ •• !

— ٢٤ —

لەناو هەموو هەورێکا ، چەندان هەورە بروسکە ، خۆیان حەشار داوە ••

---

(٢) ئەو کۆپلەیە فۆلکلۆرە ، بەوجۆرە دەستکاریم کردووە •

گشت سەهۆڵ بەندانێکیش ، خۆر ، خۆی بۆ مەڵاس‌داوە ..
تۆش ، ئەی ئەستێرەکەی من ، زوو خۆت رووت‌بکەرەوە ،
با ، لەشە کافوورییەکەت ،
شەوەزەنگی ئەم سەدە کپە رووناك‌کاتەوە ..
بەڵام لەبیرت‌نەچێ ، «خەلیفە» ئێجگار رقی لە پرشنگ‌و ، لە عەشقە .. !
« خەلیفە » لە داخی تۆ ، بەسووتووی لەشی شاعیر ،
گڕی شەو ، دائەپۆشێ ..!
کەواتە . پێش ئەوەی ئەو ، [ خۆڵو دۆ ] بکات بەسەرتاو ،
بە چەپڵەو ، تەنەکە لێدان .. خێرا شاربەدەرت کات ..
هەروا بە لەشی رووتی ، عەرەبانەکەت پڕ کە ،
لە کاسەی سەری هەموو [ خەج‌و ستێ‌و زینەکان ] ،
دەنگیش لە ئەسپەکان کە ،
با ، بەناو ئەم زریان‌و ، گەردەلوولە تووشەدا
بەرەو شاری وەنەوشەو ، عەشق ، سەریان هەڵبگرن ..
لەوێ ، ملیۆنان دڵدار ، بە چاوی خۆت ئەبینی ..
هەمووی ئاوارەو ، نامۆ ..
سەریان ناوە بە سنگ‌و ، بە سەری یەکتریەوە ..
بە چرپە بۆ یەك ئەدوون ...
چرپە شیرینەکانیان ، بۆنی ڕێحانە کێوی‌و ، مێخەك‌و ، بەفری لێ دێت..!
لەوێ ملیۆنان دڵدار ، بە چاوی خۆت ئەبینی ،
دەست‌نوێژ ، لە گۆمی خوێنی زامی خۆیان ئەگرن‌و ،
هەزاران نوێژ ، لەبەر پێی دڵدارانیانا ئەکەن .. !

ـ ٢٥ ـ

کە دوورئەکەویتەوە ، دوای تاوێ ، رائەچڵەکێم ..

وەك ئەو منالەی بەدوای دایکیا رابکاتو بگری ••
رائەکەم ، دواتئەکەوم ••
هاوار ئەکەم : ژووان گیان •• ژووان گیان •• لێمببورە ••
قەیناکە با « خەلیفە » بتکوژێ •• بتسووتێنێ ،
بەڵام بەجێممەهێڵە ••!
کەچی گڤەی گەردەلوول ، نایەڵێ گوێت لە من بێ ••
ئەڕۆیتو ••لێم ونئەبیت ••

- ٢٦ -

ئای لەو ساتانەی کە تۆ ، لێم دوورئەکەویتەوە •• !
لەو سەرخۆشانە ئەچم ،
لەناو کەلاوەو ، لەسەر شۆستەی شارە نامۆکان ،
شەوان رۆژئەکەنەوە •• !
نازانم ئەو کاتانە ، شەوم چۆن بەسەرئەچێ ••
هەر ئەوەندە ئەزانم ، هەموو شەو تا بەیانی ، خەوت پێوە ئەبینم ••
لەخەوما سواری پشتی جوانوویەکی سوور ئەبیت ،
بەسەر سەهۆڵ بەندانی گۆلی ـ زرێبار ـ دا ،
بە بەرچاوما ڕەتئەبیت ••
سەدان پۆلە باڵندەش ، بە ژوورسەرتەوە ئەفڕن ••
گوێم لێیانە گۆرانی : [ کیژان دەچنە مێر گوڵان ] بەسەر باڵاتا ئەڵێن ••
جوانووەکە ، بە نێسکەو ، ناز ، لەوسەر شووشەی سەهۆڵە ،
مل هەڵئەبڕێ ، رووەو خۆر ، جاروبار ئەحیلینێ ••
سەهۆڵەکەش لەژێریا ، کە پەلدائەنێ ، ئەشکێ ،
شەق ئەبـات •• ئەتوێتەوە ••

بەڵام خۆی ناکەوێتە ناو ئاوی گۆمەکەوە ..
لە بن گۆمەکەشەوە ، هەزاران گوڵی خنکاو ، ئەکەونە سەر ئاوەکە ..
باڵ‌ئەگرن .. ئەبن بە مەل ، ئەفڕن .. دوای تۆ ئەکەون ..
کەچی هێشتا ناگەیتە ئەوبەری ئاوەکەوە ،
لەناو دارستانێکی تاریك‌و سامناکەوە ..
پیاوەکانی « خەلیفە » ، دەست‌ڕێژێکت لێ ئەکەن ،
جەرگ‌و دڵت ئەپێکن .. !
خەریکیت لار بیتەوە .
گۆمەکە هەڵئەسێتە سەر پێ ، ئەتکاتە باوەش ..!
بەڵام ، بەڵام جوانووەکە ،
لە ئاوەکە ڕەت‌ئەبێ ، ئەگاتە ئەو بەرەوە ..
ئەشپرزێ .. بێ سەروشوێن .. چوار ناڵە ، سەر هەڵئەگرێ .. !

– ٢٧ –

[ سەمیرامیس ]یش وەك تۆ ،
«نۆما»یەکی جوانی بوو .. ئێجگار زۆری خۆش‌ئەویست ..
ڕۆژێك ، لە زۆرانێکا ، نۆماکە زامدار کرا ،
ئیتر هەر بەو زامەوە ، زۆر نەژیا ، گیانی دەرچوو ..
سەمیرامیس ، لە داخی مەرگی نۆما جوانەکەی ،
هات ، خۆی دایە بەر خەنجەر ..!
بەڵام تۆ وەك ئەو مەکە ..
تۆ ، ئەوەتا ئەسپەکەت ، دوای سەدان هەزار زۆران ،
دوای هەزاران زامدار بوون ..
هێشتا زرپ‌و زیندووە ..
ئەمجارە تۆ زامداریت ..!

– ٢٨ –

دوێنێ شەویش لە خەوما ، بە چارشێوێ نووستبووین ،
بەرەبەیان کە هەڵسام ،
تاڵێك پرچی خەنەییت ، لەسەر سەرینەکەم بوو

– ٢٩ –

وەك جارانی مناڵیم ،
هەموو شەوێ گیتارێك ئەگرم بەدەستمەوە ،
بەتەنیا بە شەقامو ، کۆڵانەکانی شارا ••
تا بەیانی ئەگەڕێم •• گۆرانیت پیا هەڵئەدەم ••
تۆ ، لەناو هەموو دەرگاو ، ناو چیغێکا ئەبینم ••
زیاتر ئەمخرۆشێنێت ••
بێ‌پەروا دەنگ هەڵئەبڕم •• خەڵکی هەراسان ئەکەم ••
پاسەوان ، دێنە سەر ڕێم ، گیتارەکەم ئەشکێنن ••
دەستیش ئەنێنە بینم ••

– ٣٠ –

تەلی گیتارەکەشم ، هەمووی یەك یەك بپچڕن ••
دەنگیشم ، تێجگار گڕو ، ناسازو ، ناقۆڵا بێ ••
بەڵام گیانەکەم ، ئەبێ هەر گۆرانیت بۆ بڵێم ••

# یادداشتی ژانەکان

## « ئۆخەی دوو گلێنەکەی پەریزاد »

**جەلال مەحموود عەلی**

سەرو ماچی کردن‌و لە شادەلیای بێ‌بنی خۆشەویستیدا ونی‌کردن • لە پەنجە زبرەکانیەوە بە تای قژە زەردەکانیاندا شەپۆلی میهرەبانی پەخش بوو ، پەرەی دڵی کاکەمەم‌و کاکەلاوی گەشە پێ کرد • شادیی ئومێدیش کۆنە جۆگەلەی فرمێسکی سەر ڕوومەتی پڕ ئەکردەوە • لەبەرخۆیەوە :

« سوپاس بۆ یەزدان • کەوتوونەتە ڕێ بینینی شەقامە بەرینەکەی ژین • ئیتر من‌و سێبەری مەرگ هەرگیزاو هەرگیز » •

گەلێك جار کاکی بەربەستی زەهەندەکەی ئەکردو ئەم بەسەر بەگژاچوونەکەدا ئەچوو • جارێکیان :

— بۆئێوە خوام لە خۆم ڕەنجاندووە ••• هەتیو ورچەکەم لێ هار مەکە •

— خوات بێت ، هەموو شتێك بە خوێ‌و ، خوێیش بە مانا • « چی‌بکات بە دڵی بێگانەم • بۆیە چاوی بە سەرم هەڵنایەت » • لەبەرخۆیەوە••• چیم بۆ نەکردو چیی پێ نەکردم •

— چەتیو کۆڵە چیلکەکەت ؟ ئا ئەمەیە ••• جا خۆ کۆڵی ••• تۆ پیرە کچێکیت •

دڵ خوێنی لێ ئەچۆڕایەوە ، بەڵام کلیلی دەریای فرمیسك بەو بوو چۆڕ چۆڕەی لە بن کەوتبوو ، چ ڕام ئەکەوت چۆن ماڵەکەم لەشان نەئەهاتە خوارەوە ؟ وەك زەرنەقووتە ، مەلاشوویان بە من هەڵدرایەوە » • لاپەڕەیەکی تری داستانی یادداشتە ترسناکەکە :

— پەریزاد ؟ نان ئەکەمەوە

— چەتیو ؟ تەماتە ئەچنم

— ملشکاو ؟ خەریکی گەوڕەکەم

— ئەوە خەوتووی ؟ نەء مەڕ ئەدۆشم

— وەرە بەلامەوە وەچ ئەکەم •

ئای ئەم دایك (•••) چۆن خۆی ئەخلافێنێتو لایەکم لێ ناکاتەوە • هالاوی زووخاو ڕووی جەرگ خوراوەکەی هەڵبزرکاندو سەرە لەرزەی پێ خست •

« کە تەلی سۆزی دڵ پسا هەیهو هەیهو ••• بێستوون بەکۆڵمەوە بوو ••• کارەکە هەر ڕقی داوێنو بەدیی ڕەوشت بوو » دەستێکی بۆ بن هەنگلی برد ، خوراندیو بزەیەکی تاڵ بەلێویا چزا • یادێکی تر :

— یاجی گیان تیسکێك سابوونم نادەیتێ ، قژم بووە بە کەپەنك •

— جا کوا ؟ ئەوە ئەسپۆنە ئەگەر ئەتەوێت !

— « سێ مانگ بوو سەرم تەڕ نەکردبوو ـ دایە گیان بیست چەرخە بێ زەردەخەنەی ژیانم ••• کە تاڵە خوایە » •

— ئەی یاجی خۆ سابوونی بەزیمان هەیە •

— چەتیو ئەوە هی کاکتە • گوێی لێ بێت بە شەقێك یەکالات ئەکاتەوە • شەقەکانی باوكو باوەپیارەکەمی تەواو ئەکرد ، ئەی پێویستی سەرشان بوو !! » •

رستەی گرێکانی ئەوسای دڵی ئەژمارد ، ئەبوو گرێی ئەو ڕۆژە بتاسایە ، هی نویی جێ تیا بێتەوە •
مێشکی برووسکەی بەیەکاچوونێکی‌تری دایكو کوری دا •
ــ مەرجە نەهێڵم چاو هەڵبهێنێت ، هەر ئەوەندە دەرفەتی بوو لەژێر مەنگەنە دەرچوو ، ئەکەوێتە سەر تەلی فاکوفیك •
ــ دایکە ئاخر نەخۆش کەوێت تووتنەکە پەکیەتی • ناوکۆڵە ، وەچە ، ئاوە ، شکاندنەوەیە ، شیش لێدانە ••• شەو ڕۆژ !!؟ •• دە تۆ فاتەی کچیشت بێنە ژێر بار •
ــ ئەو پێ حوشترە بۆرە !!؟ پشیلەی حەوت ڕۆحە ••• فاتە فاتە !! ئەی ئەوە نییە بەردەستیی خۆم ئەکات کاری ماڵیی فێر ئەکەم •

هەناسەیەکی داخ برینی ناکامی هێنایەوە سوێ • گوێزی چڵەپۆپە بوو • دەمێك بوو گەییبوو ، لە هەر چوار لاوە کوڕە لاو دڵیان تێ‌ئەگرت، بەڵام باجی چەتری سەری بوو دڵی ئەمیشی لە سێدارە دابوو ، بە پێکەنینەوە میوانەکانی بەڕێ‌ئەکرد •

ــ ( بە قوربانتان بم ، پەریزاد کۆڵەکەی گیانی خۆمو ماڵەکەمە • جا من بە بێ ئەو چۆن دەرئەبەم ) •

شۆرە سوارەکەی پەریزادیش دەمێك بوو پەروانەی سەری بوو ، کاکیشی چووبووە توێی دڵیەوە ، بەڵام باجی هەزارو یەك کێوی لەرێدا تەقاندبوو پێی ڕەوا نەدەدی تا ڕۆژێك فاتە دڵی دایکی ڕاچەنان ، میوانی دڵی فاتە جێی بە پەریزاد لێژ کرد • دەستوورە گەورە پێش‌کەوێت • بەسەر مشتومرەکەدا چوو •

ــ ڕۆڵە ، ئەو چەتیوە دامەزرێنە ، حەمە گورگە هەراسی پێ هەڵگرتم ، بەڵام بە تاڵان نا ، شیربایی ژنێك ، لەجێی ئەو با

بووکەکەم دابەزێنم •

ــ دایە حەمە گورگە پەریزادو ئێمەش ئەکات بە توێشوو با یەکێکی‌تر بێت •

بەڵام دایە زمانی گەزارە بوو• چەند فرمێسکی گەرم، کورووزانەوە رەنجی چەند ساڵە :

« تو خوا بە گورگان خواردووم مەدەن ، خۆڵەکەی ماڵەوە ئەخۆم ــ خوایە چارەی رزگاری کەی کوشتن بووە ــ •

دەم‌کوتانە چەند جار دەقی درایەوە • ناچار حەمە گورگە بوو بە زاوای باوەژن‌و بە تلیلیی پەریزادی پێ حوشتر لە دۆزەخێکەوە بۆ سەقەر گوێزرایەوە •

حەمە گورگە بڕیاری وابوو •

ــ با چاو بەرەژێر بێت یەکەم شەویەتی • چوار چار بیراز کرا •

« هەر ستوونەکەی دەرو ماڵ‌و هەوێنی نۆ قازان شیر بووم » جارەهای جاریش لەم شێوەیە خەڵکی پەریزادیان هەڵئەنا •

ــ ( تۆ تەماشا • لە پیاو پیاوەو لە ژن ژن ••• چۆن ناپووێت !!؟ بۆ هەرەوەزیش تەوەرەی ماڵی کاکیەتی ) •

بەڵام هەر زوو حەمە گورگە باوەژنی کردە کونەوە :

ــ ( ها وا پێت‌ئەڵێم تا دێراوەکەی خۆم وەستابێت چرایان ئەکەوێت شەو چرا بەدەستەوە بگریت‌و ئاویان بۆ بدەیت ، نۆبە ئاویانە نی‌یانە چش ••• )

رۆژەهای‌تر لەم‌بابەتەی ئەبیست :

— ( بەشت هەر نان‌و شەقە ••• من وات‌ڕائەگرم ••• سەریشت پێی قورسە ، فەرمو بچۆرەوە سەر تەنوورەکەی باجیت ، خۆت لەوی تێ بۆوەشێنە ) • مووچڕکەکەی ئەوساتەی پیاهاتەوە •

« بێ‌عاریان خستە دەڵیاوە وتی تـەڕ تـەڕ نەباشەد • جارێکی‌تر من‌و سێبەری ئیزرائیل •••!!؟؟ »

لەو کاتەدا کوێخا گاسنە تازەکەی بۆ ناردەوە •

— ( خاتو پەریزاد ـ فریای کاکە حەمە بکەوە گاسنەکە قاچی هەڵدریوەو لەو دەشتە کەوتووە ) •

ئەو ڕۆژە سەرەتای خوا شوکور ئاغای ڕۆیبوو بۆ بێوڵەتی • ئیـتر کاکە حەمەو دەرەوە بڕای بـڕ ئینجـا دوو جـار پیاوی دەرەوەو کەیبانووی ماڵەوە بوو ، لەبەرخۆیەوە :

« چ‌ڕۆژێکی ڕەش بوو یاداشت و پشووی شەکەتیم لە بۆگەناوی دەم هەڵکێشان بوو » خەریك بوو بخنکێت ، هەناسەیەکی قـوولی هەڵکێشاو هەڵوێست‌و بیرکردنەوەکەی ئەوسای هاتەوە یاد •

وا هاتووە ئەبێ کێش لە هەندرین بدزم ، چار هەر بەرگە گرتنەو دەروویش هەر ئەبێـت • شوکر وەجاخم ڕوونە •

وردە وردە حەمە گورگە بوو بە هـێزەو مەرگیش لە کەڵەمـوستی پێوەی تیژ دزەی بۆ سەرەوە کرد • پەریزاد کاتێکی زانی کاکە حەمـەی بێ‌دوختەر خۆیان خۆش •

ئەوسا وای لێکدایەوە :

هەر پیاوەکەی دەرو کەیبانووەکەی ماڵەوەم • هەر بیراز کردن‌و لـە بۆگەناو هەلکێشانەکەم لەدەست‌چووە »

لەو کاتەدا مامسمایل خۆی بە ماڵدا کرد :

ـــ گاسنەکەیان بۆ هێنایتەوە •

ـــ بەڵێ لاڵە •

ـــ کچم دڵ لە دڵ نەدەیت ، نەڵێیت تەنیا باڵم ، گشت ئاوایی باڵی ئێوەن• دەستووری باشی خۆیشمان تێکنادەین ، هەمیشە لە کۆمەکتاین •

ـــ لاڵە نازانم بە چ‌زمانێك سوپاستان بکەم • مناڵەکان ئێوەیان هەبێـت نوشوشتی هەرگیز ناهێنن •

مام سمایل رۆیشت ، ئەمیش ئەی‌ڕوانی‌یە ئاسۆی رۆشنی دوورو گرێ سەخنەکانی دڵی بە شێنەیی خەریك بوون خاوئەبوونەوە •

# له داغستانه‌وه

شیعری : ره‌سول حه‌مزاتۆف

وه‌رگێڕانی : محمود زامدار

## به‌ختیاری

— ئه‌مه‌وێ رووی تۆ ببینم ،
تۆ له‌كوێی ئه‌ی به‌ختیاری ‥ ؟

— من له‌و ترۆپكانه‌م ، كه تائێستا
هه‌نگاوه‌كانی تۆیان نه‌یگه‌یشتۆتێ ‥ !

— ئا ئه‌مه‌تا من له‌سه‌ر ئه‌وترۆپكانه وه‌ستاوم ،
ئه‌ی تۆ له‌كوێی ئه‌ی ئازیزه‌كه‌م ‥ ؟

— من له‌و روبارانه‌دام ، كه تۆ تائێستا ،
مه‌له‌ت تێدا نه‌كردوون !

— له هه‌زار ڕوبار په‌ڕیمه‌وه ،
تۆ له‌كوێی ، تۆ له‌كوێی ‥ !

— من له‌و گۆرانیانه‌دام ، كه تائێستا
یه‌ك دێڕیان نه‌نووسراوه‌ته‌وه ‥ !

— تۆ له‌كوێی ؟ وامن هه‌موو شیعره‌كانی خۆم
پێشكه‌شت كرد ‥ ؟

— من له‌پێشه‌وه‌م ، گه‌ر ئه‌توانی
هه‌نگاو هه‌ڵێنه ، تائه‌مگه‌یتێ

## خوێنو درۆ

ئەم چەرخی بیستەمەمان ،
رووی خۆی گرژکردوە ، تورەیە ..
ئێمەی نەوەی ئەم چەرخەیش . لەککەدارو شوورەیین ..'
تا ئیمرۆکە جیهان ئەم هەمو خوێنو درۆیەی
بە خۆیەوە نەدیوە .. !
بەماندوویی ، ئەم چەرخی بیستەمەمان ،
دیدەکانی خۆی ئەنووقێنێ ..!
ئێمەیش ، دەنگی راستیو سەربەرزیین
جیهانیش تادوایی ، هەروا بەناهەقی ناڕوا
ئەم چەرخەی ئێمە ،
چەرخی راپەڕینو بەگژاچوونە ..!

## ژنی قارەمانێک

**لاوێکی خەڵکی گوندەکەمان**
**لەتەك ژنە بسکرەشە قەترانیەکەی**
**لەتەمەنی بیستەم بەهارابوو ،**
**کاتێ کە جەنگ لەیەکی دابڕکردن .. !**
**ئێستا ژنی ئەو قارەمانەی ،**
**کە لە تەمەنی بیستەمیا خۆی بەختکرد .**
**لەبەردەم خانوەکەی دائەنیشێو قژەکەی سپی بووە ،**
**کوڕەکەی ناوی هەمان ناوی باوکی خۆی هەڵگرتوە**
**تەمەنیشی لە تەمەنی باوکی گەورەترە .. !!**

## کلیــل

من کوڕی چیام ،
هەرگیز منداڵێکی چەپەڵ نەبووم
هەمیشە لەبەردەم سەرزەنشتو لێدانا ، وەستاوم
زۆرجار باوکم ، لەبەر بزۆزیم ، گوێچکەی باداوم ...
وا ئێستایش گەورە بووم ،
گەلێجار ، زەمانە گوێچکەی بادامو بایشی ئەدا
وەك چۆن عودژەنێك ،
کاتێ کە ژێی عودەکەی خاوئەبێتەوەو ئاوازێکی نەشاز دەرئەدا ،
بەپەنجەکانی ، کلیلی عودەکەی بائەدا .. ئەئاوا ..!!

## گوناهەکانم

لەپڕێکا ، ئەی زەمانی من ،
نووکە خەنجەرم بۆ ئەوەشێنی ،
بەڕقەوە سزام ئەدەی
گوناهی دوێنێم ، لەسەر ئەمڕۆم ئەکەی بەقەرز
هەمو دردۆنگیەکانم ، وەکو باڵاخانەیەك ، ئەروخێنی ..
کێ ئەیزانی ، ڕاستیەکان ئەبن بەدووکەڵ ..؟
ئەی بۆ بەگاڵتەجاڕیەوە ، سزام ئەدەیتو تۆڵەم لێوەرئەگری ..؟
خۆ گوناهە ئاشکراکانم ، بەخواستی خۆم نەبوون
تەنیا شتەکانی تۆم دوبارە ئەکردەوە
هەرجارێ .. هەرجارێ .. کە .. !!

# ترس

ــ ئەی شاعیرەکە ،
لە دژمنە دڵپیسەکانت مەترسە ،
چونکە هاوڕێی وەفادارت زۆرترن
ــ ئەی گەر لەرۆژێکی رەشا ، پەیمانیان شکاند ••؟
ــ مەترسە ، ژنە دڵسۆزەکەت لەگەڵتایە
ــ ئەی گەر ئەمیش ، ناپاکی کرد ••؟؟
ــ باپیرە رەسەنەکان لەگەڵتان
ــ ئەی کەواتە : لەچی بسڵەمێمەوە ؟ لەچی بترسم ؟
ــ لەخۆت ، لەخۆت بترسە ،
ناپاکی لەگەڵ خۆت مەکەو بەس ••!!

# سیناریۆی داستانی دێ کۆن

محەمەد فەریق حەسەن

## بەشی یەکەم

هەر لەو ئاستەداو لە سەراوردی دیوەخانەوە لێی راکشا •• سەرنجی کردە خەرمانەی چراکە • کەوتە دۆزە دۆزەی سەرە دەزوولەکانی بیری ؛ کە وەك تەونی جاڵجاڵۆکە کاسەی سەریان تەنیبوو • لەوکاتەدا :

**(١) لەقتەیەکی گشتی**

کامێرا بە چرایەکی دووکەلاویی قەد دیواردا شۆڕدەبێتەوە بۆ سەر کوێخا •

ـ کوێخا : « لە هەموو شەوێك گەشترە •• با سەرخەوێ بشکێنم•• »

**(٢) نـاوەندی**

لە دوورەوە دەنگ دێ • کوێخا رادەپەڕێ‌و روودەکاتە دەرگای دیوەخـان •

ـ کوێخا ئەو دەنگە دەنگە چییە ؟!

**(٣) گشتی**

دەرگا دەکرێتەوە ، زەلامێك دێتە ژوورێ •

(٤) **نزيـك**
کوێخا گەش دەبێتەوە •
ـ کوێخا : « ئا ، خانەخوێکەمە ! » ئەوە لەکوێی باوانەکەم ، دەمێکە نەم دیوی ؟!

(٥) **نزيـك**
ـ خانەخوێ : بۆمان داوی بە زەویدا •• ئیتر لە دێ کۆنو چراکەت دڵنیا بـە ! ••

(٦) **نزيـك**
کامێرا لەسەر شانی خانەخوێوە •• رووی کوێخا پێدەکەنێ •
ـ کوێخا : دەسخۆش ! •• زوو زانیم ئـەم کارە هـەر لە کێشی ئێوەدایە •• بچووکتانم •• مەمنوونتانم •

(٧) **نزيـك**
کامێرا لەسەر شانی کوێخاوە •• خانەخوێ بە لەخۆباییبوونەوە •
ـ خانەخوێ : برۆ پشتی لێ بکەرەوە •• کابرا ، ئا لەو دارتەرمەدایە• سبەی بە چاوی رووناك ساتاری دەکەین •

(٨) **گشتی**
چوارکەس بە دارتەرمێکەوە دێنە ژوورێ •

(٩) **گشتی**
کوێخا پشتی لە کامێرایە • بۆ ژێر چراکە دەچی •
ـ کوێخا : « دڵم خوتوورە دەکا » •

(١٠) **گشتی**
چوار کەسەکەو خانەخوێ لە دەوری دارتەرمەکە سەریان نـاوە

بەیەکەوە •

**(١١) ناوەندی**

کوێخا لەژێر چراکەدا پاڵیداوەتەوە • دڵە راوکێیەتی •

ـ کوێخا : « تەگبیری چی بکەن ؟ ! •• با سەری هەڵدەمەوە بزانم خۆیەتی ؟ »

**(١٢) نزیـك**

چراکە تەپە تەپ دەکا •

**(١٣) نزیـك**

رووی کوێخا ، پێی ناخۆشە •

**(١٤) گشتی**

دارتەرمەکە دەجووڵێتەوە •

**(١٥) نزیـك**

کوێخا ترسی لێ نیشتووە •

ـ کوێخا : « ئەوە خۆ زیندووی لە ناودایە •• !! »

**(١٦) ناوەندی**

ـ کابرا ـ لەناو دارتەرمەکەدا راست دەبێتەوە • دەمامکی کردووەو شمشێری پێیە •

**(١٧) نزیـك**

کوێخا پەشۆکاوە

ـ کوێخا : « کابرایە !! •• گەمارۆیان دام •• هاتوون کێشـەی هەزار ساڵەیان لەسەر حیسابی من تەخت بکەن •• »

(١٨) **گشتی**
کامێرا لەسەر رووی چوار کەسەکەو خانەخوێ دەگەڕێ ••
هەموویان لەپشتی کابراوە ئامادەن‌و لەسەری دەکەنەوە •

(١٩) **ناوەندی**
کوێخا پەلاماری چراکە دەداو هەڵدێ •

(٢٠) **گشتی**
تاقمی کابرا دوای دەکەون •

(٢١) **گشتی**
دەرەوەیە • کابرا بەشمشێرەوە • تاقمەکەشی بەدوایەوە ، شوێن
کوێخا کەوتوون •

(٢٢) **ناوەندی**
کوێخا بە چراکەوە لە کەلاوەیەکدا هەناسە بڕکێیەتی ، چەند کەسێکی
شپرزەی لەدەورە •

(٢٣) **گشتی**
لە چاوی کوێخاوە شەش کەسەکە دەبنە گیاندارێکی ئەفسانەیی •
تیغەکانیان دەچنە سەر یەكو دەبێتە شمشێرێکی زۆر گەورەو بانگی
دەکەن •
ـ گیاندارەکە : بووی بە تەڵەکەوە ! « دەنگت بە کەس ناگات ! »
بڵاوەیان پێ بکەو خۆت بدە بەسەر کەوشەکانمدا ! ••

(٢٤) **ناوەندی**
کوێخا پەشۆکاوە ، پرس بە ئاوەڵەکانی دەکا •
ـ کوێخا : بیر لە چارەیەك بکەنەوە !

(٢٥) **گشتی**
کامێرا لەسەر رووی ئاوەڵەکانی دەگەڕێ • دەمیان گۆ ناکا قســە بکەن •

(٢٦) **نزیــك**
رووی کوێخا
ـ کوێخا : « کردەی من بوو ، بردەی خانەخوێ • دەستم لە بنــی هەمانەکەوە دەرچوو ! » چی بەم خەڵکە بڵێم ؟! •• »

(٢٧) **نزیــك**
رووی گیاندارە ئەفسانەییەکە ، ترسناکەو قسەکانی دەنگ دەدەنەوە •
ـ گیاندارەکە : چراکەت بیر نەچێ • دەمەوێ فوویەکی وەهای لێ بکەم هەڵگیرسانەوەی نەبێ !! ••

(٢٨) **نزیــك**
رووی کوێخا ، تەواو پەشۆکاوە ، بیردەکاتەوە •
ـ کوێخا : « دێ کۆنم چوو ! • چارێك بۆ چراکە بدۆزمەوە نــەکا سەرکەشێك دوای خۆم هەڵی کاتەوە !•»

## دیمەنێکی ئەو ڕۆژە بەیانی خێرا

(١) **لەقتەیەکی گشتی**
کۆمەڵێ کێشکچی لەسەربان دامە دەکەن •

(٢) **نزیــك**
کامێرا بە بانەکەدا دێتە خوارێ بۆ سەر کۆگایەك ، کە بە گەورەیی ناوێکی لەسەر نووسراوە • کڕیار دێن و دەڕۆن •

(٣) **گشتی**

ناو کۆگا • خەڵکی کەل‌وپەل دەکڕن • فەرمانبەرێك پسووڵەیەکی پێیە •

(٤) **ناوەندی**

بەڕێوەبەر پارە دەژمێرێ •• پسووڵەکە وەردەگرێو دەیخوێنێتەوە•
ـ بەڕێوەبەر : چی چی ؟! •• دەست بەردەن‌و بلاوەی لێ بکەن؟!••

(٥) **نزیك**

دەنگی برێکێکی قایم‌و رووی بەڕێوەبەر ، رادەچڵەکێ •

(٦) **زۆر نزیك**

تایەی ئۆتۆمۆبیلێك ، تۆزی لێ بەرز دەبێتەوە •

(٧) **گشتی**

کامێرا لەناو ئۆتۆمۆبێلەکەوە دەڕوانێ • پۆشتەو بەرداخێك سێ کەسی بەدواوەیە • خۆیان بە کۆگاکەدا دەکەن •

(٨) **گشتی**

بەڕێوەبەرو میوانە پۆشتەکە سەریان ناوە بەیەکەوە ، ئیشارەتی سەربان دەکەن •

(٩) **ناوەندی**

بەڕێوەبەر دەچپێنێ بەگوێی پیاوێکدا •

(١٠) **گشتی**

پیاوەکە لەناو کێشکچییەکانی سەرباندایە •

**(١١) گشتی**

کێشکچییەکان خۆیان گورج دەکەنەوە • رووی ئاگربەندەکانیان لەسەر ئاواییی‌یە •

ـ کێشکچییەکان : کابرا هات •• هات •• هات ! •• تەتەتەتە •

**(١٢) گشتی**

ئاوشار ، راکردنە ، خەڵك بەسەر یەکدا دەکەون •• دەنگی ئاگربەندەکان بەردەوامە •

**(١٣) ناو کۆگا**

بەڕێوەبەرو میوانە پۆشتەکە سەرو جانتایان گرتۆتەوە ، پارەی تێدەکەن •

**(١٤) زۆر نزیك**

لوولەی ئاگربەندێكو دەنگی خاوەنەکەی •

ـ کێشکچییەك : هات ، هات •• تەتەتەتە •• سەردەرکەن ! ••

**(١٥) نزیك**

رووی میوانەکە پڕ بە کادیر ، پێدەکەنێ •

**(١٦) نزیك**

رووی بەڕێوەبەر لەنێوان چەپکێ پارەی کاغەزەوە •

**(١٧) گشتی درێژ**

فەرمانبەرانی کۆگا هەریەکە بە کۆڵێکەوە • کامێرا لە یەکێکەوە دەچێ بۆ ئەوی‌تر •

**(١٨) گشتی**

بەڕێوەبەرو میوانەکە بە جانتاوە دەڕۆنە دەرەوە •

**(١٩) گشتی**

ئۆتۆمۆبێلەکە پشتی لە کۆگاکەیەو بەخێرایی ون‌دەبێ •

**تێبینی :**

ئەم دیمەنە دوای بڵاوبوونەوەی بروسکەکەی کوێخا رووی‌دا ، کە ئەمە دەقەکەیەتی : دەست‌بەردەن‌و بڵاوەی لێ بکەن • ئاگربەندەکانتان بکەنە داربەیاخ‌و رانکەکانتانی پیا هەڵواسن • (١) روو لە هەرلایەکیـان

---

**(١) لێدانەوەی ئەنجامی ڕستەکە بە سلۆمۆشن •**

لاوێك کە گوێی لە بروسکەکە بوو ، سەری‌هێناو سەری برد ، چـارەیەکی بـۆ نەدۆزرایـەوە • هەرچەنـدە هێمـاکانی بەیـەکدا داو خستنیە پاڵ یەك نەگەیشتە معادەلەیەك • لە تواناشیدا نەبو شان بداتە بەر قورسایی ئەوکەسەرە • جیابووەوە •• رۆیی رۆیی •• لەسەر لوتکەیـەك ئێستێکی کرد • سەرنجێکی بەرپێی دا ، هەڵدێرو هەزار بـە هـەزار •• کشایەوە ، دانەوییەوە • هەردوو لەپی نایە بان زەوی • چەند جارێ گوناى زەوی‌یەکەی ماچ‌کرد •• هەڵسایەوە • ئاگربەندەکەی لە شـانی دامـاڵی‌و باوەشیان بەیەکدا کرد •• چووە پێش ، پێشتر ، لێـوار •• لەبنـارەوە روبارەکە بەنێوان تاش‌و گابەردەکاندا دەکشاو ڕێگەی بۆ خۆی دەکردەوە•• ئاگربەندەکەی ماچ‌کرد •• بازێکی‌داو لەسـەر تاشێـك گیرسـایەوە • رەتێکی‌بردو سەری کەوتە ژێری •• گلا ، لەسەر لا ، بەرووودا •• هەتـا گەیشتە گومەکەی دامێن ، لەگەڵ ئاگربەندەکەیدا خاك‌و خۆڵیان بەسـەر خۆیاندا کرد •• خۆر چاوی تێوەبوو • بۆی چووە سوجدە • روبارەکەیش هەناسەیەك بۆ گیانی پاکی وەستا • ئەمجا وەکو سوورە ماسییەکی نامـۆ کردییە باوەش •

**ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٧**

دەکەن سەرپشك بن • گەیشتنە بەرایی هەرکامێـکیان بەیاخەکانتـانی پێشکەش کەن • منیش لێرەوە چراکەم وردوخاش کرد •

---

سلۆمۆشن : التصویر البطیء •

پانی خێرا : جۆرە لەقتەیەکی خێرایە ، کامێرا بەپەلە ، لە رووبەکەوە ، دەچێتە سەر یەکێکی دی ، بێئەوەی کامێرامان دەست لەسەر دوگمەی کامێراکەی هەڵـگرێ •

تێبینی : ئەم کورتە چیرۆکە لە ١٦ـ١٢ـ١٩٧٧دا ،لە کۆڕێکی یەکـێتیی نووسەرانی لقی سلیمانیدا ، خوێندراوەتەوەو لەلایەن مامۆسـتـا کەمال میراودەلییەوە هەڵسەنگێنراوە •

# سێ پارچە شیعر

## - ١ -

## کاروانی پرس

**حەمە سەعید حەسەن**

+ چۆنت توانی ماوەی نێوان خۆرو زەوی کەم کەیتەوە ؟
زمانی خەڵکی سەر زەوی لە ئەستێرە تێ گەیێنی ؟
لە زێڕ پەیکەر بۆ مرۆڤە برسی‌یەکان دابتاشی ؟
چۆنت توانی هەموو جیهان بهەژێنی ؟
لەم شەوەزەنگە تارەدا ، هەزار مۆمو چرای نەمر داگیرسێنی ؟
چۆنت توانی منداڵ فێری دڵداری کەی ؟
رەگی قین لەم خاکە پانو بەرینەدا بنەبڕ کەی ؟
مارو دووپشکە تووڕەکان ، بۆ هەتا هەتایە سڕ کەی ؟
چۆنت توانی بووکی لادێ لە زاوای شار مارە بکەی ؟
جیاوازی نێوانی چیا بەرزەکانو دەشتەکانی کەنار دەریا بسڕیتەوە ؟
چۆنت توانی ئازار بکەیتە ئەفسانە ؟
خەم بکەیتە سێبەری خوا ؟
لەسەر زەوی بەهەشتێکی راستەقینە بنیات بنێی ؟

× × ×

+ کە توێشەبەرە دەبەستی‌و نیازی سەفەرێکی دوورو درێژخایەن
لە دەروونتا چرۆدەکا ، شارەزای رێی ؟

کە ڕێبواری کاروانێکیو ڕووەو لوتکەی سەختو بەرز ،
هەنگاو دەنێی ، پێشەنگی کاروان دەناسی ؟
هەموو شەوێ لە ئاسمانی بەرینی پڕ ئەستێرەدا ،
کە ئەستێرەیەکی غەمگین ، سەرەتاتکێت لەگەڵ دەکاو
ژووانت بۆ دیاری دەکا ، لە ژووانگە دوا ناکەوی ؟
وەکوو هەوا دەچیتە گەرووی شوانەوەو بوارنادەی
شمشاڵو دەستو لوتکەی شاخ
هەست بە شەکەتی‌ی شوان بکەن ؟
کە زەروو تیشکی خۆر دەمژێ
وەکوو هەموو عاشقێکی چەپکە هەتاو
تەزووی سەرما پەنجەکانت دەتەزێنێ ؟
لە ناخەوە گۆرانی سەرکەوتن دەڵێی
کە بەستەڵەك لە بەردەمی سوپای خۆرا هەرەس دێنێ ؟

× × ×

**یەکەم هەوار :**

کە چاوەکانت کردەوەو ، لێوەکانت زەردەخەنەیان نەناسی ،
لەگەڵ شیرا خەم ڕژایە دەروونتەوە ،
لە باوەشی زامو ئازارێکی سەختا پەروەردە بووی ،
لە دەریای خوێنو ئەشکەوە بەرەو کەنار پەلت کوتا ،
لە بیابانی شەوێکی دوورو درێژو سامناکا ،
بێدار بوویتو بۆ تاوێکیش کۆرپەی خەوت نەگرتە کۆش ،
بە خوێناوت رووبار رەنگی سوور هەڵگەڕاو
دەست بەرداری ئەو عەشقە خاوێنە نەبووی ...
لە هەرەسی چیای لاشەی ئازیزانتا

درەختی چاوی خەمناکت
چنگی برژانگی لە زەوی گیردەکردو لقی پێلووی
سێبەری بۆ رێبوار دەکرد ••

× × ×

**بیرخستنەوەیەك :**

کە گەڵای درەخت دەوەرێ
گەر باڵندە یاخی نەبێ
گوللەی راوچی دەیپێکێت و
نامەی مردنی دەنووسرێ •

× × ×

**رێبوارانی کاروانـەکە :**

١ نیو سەدەیە ناخت باباگوڕگوڕێکە ،
ئاگرێکی بەرزو پیرۆزی تیا بەندە
کەی دیواری چاوەڕوانی دەڕووخێنی و
پۆلە مەلی بڵێسەی گڕ ئازاد دەکەی ؟

٢ بۆ وەکوو خاك لە رەگی درەختی سپڵە یاخی نابی ؟
بۆ وەك چاوی تیژی هەڵۆ ،
لە مەودای کورتی بینینت یاخی نابی ؟
وەك مەلێکی وریاو بزێـو
بۆچی لە داوو پەرژینت یاخی نابی ؟
وەکوو دلێکی فراوان ، بۆ لە سنووری سنگی تەنگ یاخی نابی ؟
بۆ وەکوو لەشێکی وشیار ، لە سەرێکی وڕو دەبەنگ یاخی نابی ؟

× × ×

٣ ماسی فێربوو ، چۆن هاتوچۆ لە نێوانی تۆڕا دەکرێ ،
مەل فێر بوو چۆن دان بخواتو داو نەی گرێ ،
ئەی تۆ کەی جریوەی مۆمێ بەرچاوت روون دەکاتەوە ؟
ئەی تۆ کەی پەریی فام و بیر ، ئاوڕت لێدەداتەوە ؟
ئەی تۆ کەی زنجیری سەرنج ،
دەکەیتە چاوی هەنگاوت ؟
ئەی تۆ کەی لە شایی خۆزگەی خوێناوی‌یا ،
هەڵدەپەڕیو ،
کەی دەگاتە لوتکەی چیا ، رووباری خۆزگەی خوێناوت ..

## - ٢ -

## چەپکە هەتاو ئینجانەی خۆر جێناهێڵێ

ئەم هەورە رەشە چڵکنە ،
تا چاو بڕ کا ، بەری ئاسمانی گرتووە
بە پەرژینە خوێناوی‌یەکەی
چوار دەوری باخچەی ئەستێرەی تەنیوەو
دڕکەزی‌یەکانی لە گۆنای ناسکو تەڕی ،
لەرەی جریوە گیردەکا
ئەم هەورە رەشە چڵکنە ،
یاساوڵی سەر سنوورەو
داوای پسووڵە لە تیشکی خۆرو تریفەی مانگ دەکا
ئەم هەورە ڕەشە چڵکنە کەمینەو خۆی

بۆ پۆلە مەلی کوێستانان ناوەتەوە
ئــەی هەورەکە ،
گەر دەتەوێ ئەستێرەکان نەجریوێنن ،
چەپکە هەتاو لە ئینجانەی خۆر دابڕی ،
ڕەگی قووڵو هەتا ناخ چووی
تریفە لە دەروونی مانگ دەربهێنی ،
گەر دەتەوێ پۆلە مەل ئاسمان تەی نەکاو
گۆرانی وتن لە بولبول قەدەغەکەی ،
وەرە کۆتی گرانی خۆت
لە گەردنی جریوەو تیشكو تریفە بئاڵێنە
وەرە باڵو دەنووکی هەموو مەلەکان بقرتێنە
دەنا ئیتر مەگرمێنە ،
مەگرمێنــە ..

## – ٣ –

## عەنبەر خاتوون

« کە درەختێ لەناو قەدا دەبڕنەوە ،
بۆ کەس پرسەی بۆ دانانێ ؟ »
کە سەرچاوەیەکی روونی دامێنی چیا لێڵدەکرێ
بۆ رووبــار
بارەگای بەرزی ئاسمان
ناهەژێنێ بــە هاوار ؟
بۆ یەخەی یەزدان ناگرێ ؟

ماسی بۆچی مان ناگرێ ؟
که باڵای گوندێکی بنار
له ناو تەما بزر دەبێ
بۆ خەڵکی شـار
لوتکەی چیای بۆ ناگەرێ ؟
که گیانی پاکی مەولەوی ،
خۆراکی لێدەکرێ بەژان
بەراز ، هێرش ، بۆ رەزی مەزاری دێنێ
بۆچی شاعیر نای‌خاتەروو ناخی دەروون ؟
بۆچی شاعیر ، شیعرێ نـاڵێ
ئەوەندەی قەوارەی زامی شفرەی بەراز ؟
بۆچی شاعیر ، گوڵێکی سوور
نادا له کوێستانی قژی عەنبەر خاتوون ؟

# خانەنشین

هێرۆ گۆران

بەیانی‌یەك بوو لەو بەیانی‌یە قورسانەی (مام کەریم)ی پیریان پێدا تێدەپەڕێ • هەستی دەکرد بە گران خۆی پێ ئامادە دەکرێ بۆ چوونە قوتابخانە • هەستی بە قورسیی‌و بارستایی ساڵەکانی تەمەنی دەکرد •• بە کۆنیی خۆی ••• وەکو کۆنیی ئەو چیایانەی بەیانیان سەرنجی دەدان‌و پێیان راهاتووە •• لەوانەیە لەم بەیانی‌یانەدا (مام کەریم) بیری خانەنشینی‌یەکەی کەوتبێتەوە کە چەند مانگێکە وادەی هاتووە • بەڵام خۆی‌و بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەی ئیشی تیا ئەکات پشت‌گوێیان خستووە •

چەند مانگێکە ئەیەوێ مەسەلەی خانەنشینی‌یەکەی لەبیر خۆی بەرێتەوە • هەوڵ‌دەدا ئەو خەیاڵە لە مێشکی دەربکا • وێڵێ دوای رووداوی رۆژانە بێ •• کاتێ بیری لەمە کردەوە زەردەخەنەیەکی سووك پەڕی‌یە سەر لێوی‌و لەبەرخویەوە وتی :

چ‌پیویست بە درۆکردن دەکا •• لەکاتی گەسك‌دانی ژوورەکانی پۆلدا ، کاتێ پشتی ئازاری دەدا •• بیر لە خانەنشینی دەکاتەوە •• هەروەها کاتێ فریای بەرنامەی (پەندی پێشینان) ناکەوێ لە رادیۆ کۆنەکەیەوە •• کاتێکیش یەکێك لە خزمانی لادێی تووشی بەڵایەك دێ

یاخود شایی‌یەك دەبێ‌و بە پێویستی دەزانێ سەریان بدات •• یان کاتێ قوتابخانە دەیبەستێتەوەو ناهێڵێ بەدوای کارەکانیدا بڕوا •• ئارەزوویەکی کوت‌وپڕ ئەیجووڵێنێ‌و پاڵی پێوە ئەنێ تاکو لەگەڵ بەڕێوەبەردا بکەوێتە باسی خانەنشینی‌یەکەی •

وەکی‌تریش •• کە گوێی لە ستایشی مامۆستایان‌و قسە خوشەکانیان دەبێ بەتایبەتی کە دەڵێن لەگەڵتا ڕاهاتووین (مام کەریم)و بێ تۆ هەڵناکەین •• ئەم قوتابخانەیە پێویستی پێتە •• لەوکاتانەدا بەتەواوی مەسەلەکەی لەبیر ئەچێتەوە ، هەست بە گرنگێتی خۆی دەکا • بە گەورەیی ئەو ئەرکەی جێبەجێی دەکا •• هەست بە لێپرسینەوەیەکی گەورەتر دەکا بەرامبەر قوتابخانە •• قوتابیان •• کەل‌وپەل •• تەنانەت وانەکانیش بونەتە بەشێکی گەورەی ژیانی • ناتوانێ بیهێنێتە پێش چاوی ئاخۆ دوای دوورکەوتنەوە لە قوتابخانە ژیانی چۆن دەڕوا • یان دوای ئەم کاری قوتابخانەو مامۆستایان چۆن مەیسەر دەکرێ •• بیست ساڵ لە تەمەنی لیرەدا بردوەتەسەر •

ـ هەموو کون‌و قوژبنەکانی شارەزایە •• نهێنی‌یەکانی •• کورسی‌یەکان •• میزەکان •• باخچەکە •• نەخشەکان کە بە شێوەی لوول‌کردن‌و هەڵگرتنیاندا ئەیان‌ناسێتەوە •• تۆمارە کونەکان •• سنووقە تەباشیرە گەورەکەی دوێنێ هەڵیگرت‌و بەشێوەیەك شاردی‌یەوە شەیتانیش پەی پی نابات • کاتێ هەوڵی پەرینەوەی شەقامێکی جەنجاڵی دەدا •• کوت‌وپڕ بیری کەوتەوە کە قوتووی تەباشیرەکانی پۆل بەتاڵن •• وای دەزانی دوا کەوتووە •• لەوەدا بوو هەنگاوە سستەکانی گورجتر بکا•• گورج‌و گۆڵی‌یەکی نوێ گوڕی بە ئەندامە ماندووەکانی دەدا •• پیویستە لەگەڵ بەردەستەکەی هاورێیدا ژوورەکان گەسك بدەن •• ئەو منداڵە

بزێوانـه پـڕی گیرفـانیان گوڵەبەڕۆژەیـە •• هەرچەنـدە بـەردەوام سەرزەنشتیان دەکاو پیایاندا هەڵدەکاڵێ •• بێسـوودە •• بـە هەمـوو لایەکدا توێکـڵەکەی بـڵاو دەکەنـەوە •• بـەڵام لـەگەڵ ئەوەشـدا خۆشیدەوێن •• ئەوکاتانەشی خۆشدەوێ کە گوێی بـۆ شـلدەکەنو چاوەکانیان بریسکەیەکی سەرنج ڕاکێشیـان تێـدایە •• کاتـێ بـە دەم ئیشەوە چیرۆکو پەندی پێشینانیان بۆ دەگێڕێتەوە •• هەروەها لە کـاتی پشوودا •• دڵی بروایی نەئەدا منداڵێکی سزادراو ببینێ هەنسك بـداو فرمێسك بڕێژێ •• دڵنەوایی دەکرد تا زەردەخەنە دەکەوتەسەر لێوانیو بریقە دەگەڕایەوە چاوانی •• با ئەو منـداڵە هـارو هـاجو خەتابـاریش بوایە •• با ئەمیشی تووڕە بکردایە دڵی بروایی نەئەدا بـە دڵ تەنـگیو بەدەم ئازارەوە ببینێ •• قسەکانی باوکی ئەهاتەوە یاد : ( تاوانە منـداڵ سزاو ئازار بکێشێ ) •• منداڵـەکانی خـۆی گەورە بـوون •• لـێی دوورکەوتوونەتەوەو خاوەنی ماڵو حاڵی خۆیـانن • ئەم ژیانەی ئێستـای سەردەمی زووی منداڵەکانی خـۆی بیردەخـاتەوە •• خانـەنشینی •• هەناسەیەکی دریژی هەڵکێشا •• ئەم وشەیەی چەند بەلاوە گرانـە •• لەگەڵ خۆیدا سێبەری ژیانێکی پووچ دەهێنێ • ژیانێکی نادیار کە پـێی زانەهاتووە •• نەخێر ئەمرۆ ناوی خـانەنشینی لای بەرێـوەبەر نابـا •• ڕوژێکیتر بۆی باسدەکا •

لەم کاتە خانووی قوتابخانەکەی لێوە دیـار بوو •• لـێی نزیـك ئەبووە • دار گوێزە تاقانەکەشی بە لقو پۆپو گەڵا سەوزو چڕەکانێوە • ویستی لە شەقامەکە بپەڕێتەوە بۆ قوتابخانە • لای ڕاستی شەقـامەکەوە لۆرییەکی زەبەللاح بەخێراییی نزیك دەبووەوە • زەوییە قیرینەکـە لەژێر زەبری پێچکەکانیدا دەیزریکان • کاتێ (مام کەریم) لە چەقـی شەقامەکەدا ئاوڕی دایەوە تاکو ئەو لایەش تـاقی بکاتەوە •• هیچی نەدی

پێشیێکی ئاسنینی گەورە نەبێ کەوتە بەرچاوی • ئەوەندەش مۆڵەتی نەبوو تا بزانێ چدەعبایەکە •• بەدوایدا زەبرێکی بەهێز لەپڕ بەر سەری کەوت •• لە زەوی بەرزی کردەوە •• کاتێ بە خۆی زانی رەهێڵ بووە• بەوەدا زانی درێژ بووە کە ئاسمانی شینی بە بان سەری‌یەوە بینی • درەختە گوێزە سەرکەشەکەش سەرنجی دەدا •• قوتابخانە •• تەباشیر•• کۆمەڵێ دەنگی نائاشنا وەکو خوڕەی ئاو خویان بۆ ناو گوێی دەکوتا •• هەندێ لە قوتابیانی قوتابخانەکەیش ئەڵقەیان لە دەوری دابوو •• خوێن لە گوێو دەمو لووتی‌یەوە فیچقەی دەکرد • بەشێکی زۆری سەرگەردنی داپۆشیبوو ، لەبەرخۆیەوە وتی : ـ چەند منداڵێکی خاوەن بەزەیین • خۆیان بەسەردا داڵەشۆڕە کردووە ، بەسۆزەوە دەستی بۆ دەهێنن • گومانی تیا نیە لێی قەوماوەو •• پێویستی بە جۆرە یارمەتی‌یەك هەیە •• کەواتە ئەم منداڵانە فێری ئەوە بوون دەستی یارمەتی بۆ کەسێ درێژ بکەن ئازار بچێژێ • یاخود بەشی خورابێ •• وەکو چۆن ئەم لەگەڵیاندا دەجوولایەوە •• تۆ بڵێی چی لێ قەومابێ ؟ چی بێ ؟ خۆ ئەوە کاروانە، هارو هاجە دەستی بە باڵی‌یەوە گرتووە •• منداڵەکان هەوڵدەدەن هەڵی‌بستێننەوە •• بەڵام کە جووڵاندیان هەستی بە ئازارێکی هێجگار سەخت کرد نەی‌توانی دەری‌ببرێ •• ئا ئەوەش سیروانە چاو شینە •• داوێتی‌یە پرمەی گریانو هاوار دەکا :ـ

ـ مەیجووڵێنن •• ئازاری ئەگا •• مەیجووڵێنن • غەڵبە غەڵبو هەراو زەنا پەیدا بوو •• ئۆتۆمۆبیلێك دەوەستا •• نەی دەتوانی چاوە شینەکانی سیروان ببینێ •• منداڵەکانی تریشی چاویان ببووە کۆمەڵێ چاڵی تۆخ •• نەی‌دەناسینەوە • نەی‌دەناسینەوە •• لقە دار گوێزەکە وەکو سێبەریکی خەستی بێ‌سنوور لە بەرچاوی دەردەکەوت •• خوڕەی

ئاوەکەش لە گوێی بڕا • بە هێمنی هەستی بە وەستانی هەموو شتێك کرد •• بە هێمنی لەگەڵ سێبەری سەری منداڵەکانی چوار دەوریدا دوا چرپە کە بەیادیا هات ئەمەبوو :

ـ منداڵەکان فێربوون •• منداڵەکان خاوەن بەزەیین •

**محەمەد فەریق حەسەن**

**کردوویە بە کوردی**

**١٩٧٨**

# لەنێوان حەقیقەت و وێژداندا

ئەحمەد محەمەد صالح

ئەوەی بەشوێن مانایەکی فراوانی وشەی ( حەقیقەت )دا بگەڕێت ، هەر لەگەڵ بیستنی‌دا موچوڕکەیەك بە لەشیا ئەڕوات‌و ئەوسا بیری پەرت‌و بڵاو ئەبێتەوە بەچەشنێ کۆکردنەوەی گران ئەبێت‌و زاڵبوون بەسەر دۆزینەوەی پێناسێکی چڕدا زەحمەت ئەبێت .

لە کۆنەوە زانایان لق‌و پۆپیان لەم وشەیەش کردۆتەوەو لە ئاستی پێوانەیەکی فەلسەفی‌دا تاوتۆیان کردوە ، ئەوەی تەنها لە ڕێگەی هەستەوە رووکەشانە بە حەقیقەتی ئەزانین ڕەنگە دوور بێت لە ڕاستیەوە . ڕەنگە ئەو هەستەمان بەهەڵەماندا بەرێت ، ڕەنگە لە قوڵبونەوەو تێگەیشتنیدا بەشێوەیەکی مەوزوعیانە حەقیقەتێکی‌ترمان دەست‌گیر ببێت . گوێت لە دەنگێك ئەبێت بێ‌ئەوەی خاوەنی دەنگەکەت لەپێش چاو بێت یا بیناسیت بە پێی لێکدانەوەیەکی خێرا تەنها بەهۆی بیستنەکەوە بە دەنگی پیاوی ئەدەیتە قەڵەم بەڵام پاش‌ئەوەی خاوەنی دەنگەکە ئەبینی بۆت دەرئەکەوێت ئافرەتێکی دەنگ‌نێرە ؛ ئەوەی یەکەمیان حەقیقەتێکی هەستی بوو کە دوور بوو لە ڕاستیەوەو ئەمەی دوەمیان حەقیقەتێکی مەوزوعی بو کە کەس ناتوانێ

ئینکار له ڕاستی بکات • لێرەدا هەستی بیستن ئێمەی بەهەڵەدا برد • بە چاو ئەبینی دوو هێڵی شەمەندفەرێك دوای دورکەوتنەوە ( یانێ ڕوانین بۆ دوورتر لەئاستی خۆتەوە ) بەیەك ئەگەن ، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی مەنتیقی بیرت لێ کردەوە بۆتدەرئەکەوێت کە ئەو دوو هێڵە دوو هێڵی هاوتەریبن هەتا هەرکوێ گەیشتبن هەرگیز بە یەك ناگەن • لێرەشدا ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە حوکمی بینین قەناعەتمان بهێنایە ئەوا هەڵە ئەبوین • کەواتە لە زۆر کاتدا حەقیقەتی هەستی ساکارو رووکەشبەو پێویستە ڕەتبکرێتەوەو پێویستە بگەڕێین بەشوێن حەقیقەتێکی مەوزوعیدا چونکە هەر ئەمیانە مرۆڤ ئەگەیەنێتە قەناعەت بە بەڵگەی سەلمێنراوەوە •

ئەمەی دوەمیشیان (حەقیقەتی مەوزوعی) پەلوپۆیتری لێ کراوەتەوە بەپێی ئەو جیاکردنەوەیە هەیە حەقیقەتێکی مەوزوعی موتڵەقەو هەشە حەقیقەتێکی مەوزوعی نیسبیە •

هەریەکێك لە ئێمە کە قسە ئەکەینو ئەخۆینو ئەجوولێین لە گۆشتو ئێسكو خوێن پێكهاتوین • هەرکەسێك بیر لەمە بکاتەوە ، سەر بە هەر گەلو چینو ئاینێك بێت ناتوانێ ئینکار لەوە بکات ، کەواتە ئەوە حەقیقەتێکی موتلەقە •

ئەوەیتر کە پێیوتراوە حەقیقەتی نیسبی ـ ئەڵبەت مەبەست لەوەیە کە لەلایەن کەسانێکەوە حەقیقەتێکی مەوزووعی موتڵەقە ، بەڵام لەلایەن کەسانێکیترەوە بەپێی بۆچونو لێكدانەوەی خۆیان نە حەقیقەتەو نە مەوزوعیشە • بەنموونە لەلایەن ئابووریناسانی سیاسی سەر بە چینی کرێکارو فەلسەفەی مەتەری کرێکار کۆڵەکەی بەرهەم هێنانی هەر بەرهەمێکەو بە بێ ئەو نابێت • هەر لەبەرئەوەش ئەو زێدەباییەی لە پرۆستیسی بەرهەمهێناندا دێتە کایەوە ئەنجامیماندووبونی بازووی ئەوە بۆیە مافێکی ڕەوای ئەوەو هیچ هۆیەکیتری بەرهەمهێنان چ وەك ئامێرو

چ وەك سەرمایە بە بێ بوونی ئەو بازوە بۆی نیە زیاد بکاتو کەڵەکە بێت • بۆیە زانایەکی ئابوری‌ناس ئەڵێت ( مرۆڤ گەورەترین سەرمایەیە)، بەڵام بەلای ئابووری‌ناسەکانی سەر بە ئابووری سەرمایەداریەوە ئەمە بە شێوەیەکی‌ترە ئەویش ئەوەیە سەرمایە لە کاردایە ، ئەو سەرمایەیە کۆڵەکەی بەرهەم هێنانەکەیە کەواتە ئەو زێدەیەی لەئەنجامی بەرهەم‌هێنانو فرۆشتن‌دا دروست ئەبێتو پێی‌ئەوترێ قازانج مافی ڕەوای خاوەن سەرمایەکەیە •

وەك بینیمان لێرەدا هەرکەس بەپێی بەرژەوەندی خۆی بۆ حەقیقەت چو هەریەکەشیان حەقیقەتی خۆی بە مەوزوعی ئەزانێ کە ڕەنگە لایەکیان راست بێت بەڵام لاکەی‌تریان لەگەڵ ئەوەش‌دا کە هەست بە راستی لاکەی‌تر ئەکات بەڵام لەپێناوی بەرژەوەندا خۆیان لەو ڕاستیە گێل ئەکەن • لێرەدا قسەیەکی بەنرخی زانایەکم دێتەوە یاد کە ئەڵێ « ئەوەی حەقیقەت نازانێ گێلە ، ئەوەش ئەیزانێو خۆی لێ گێل‌ئەکات تاوانبارە »•

شتێکی‌تر لە سەرو هەمو ئەوانەوە سەر هەڵ‌ئەدات کە پێی‌ئەوترێ ویژدان • ویژدان بریتیە لە موحاکەمە کردنی مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە بە ئامانجی قەناعەت بەخۆدان • جا ئەوەی کە حەقیقەت ئەزانێو خۆی لێ گێل ئەکاتو خۆشی بە تاوانبار نازانێ بێ‌گومان ئەو دەستگای مەحکەمە دەرونیەی خۆی مردوەو یانی مرۆڤێکی بێ‌ویژدانە • مرۆڤیش کە ویژدانی نەبو یانی لایەنی ڕەوشتی لاسەنگە ، چونکە ویژدان تەواوکەری مرۆڤە • دەبا ئەگەر ئەمانەوێت مرۆڤێکی خاوەن هەستی مرۆڤایەتی‌و خاوەن رەوشت بین ، مەسەلەی حەقیقەت بەشێوەیەکی مەوزووعی‌و لەسەروو بەرژەوەندی خۆمانەوە لە ویژدانمان‌دا لێك‌بدەینەوە •

# ستراني ژ مهابادێ

موءييهد طهييب

سبه دایێ ..
هێشتا تاری
بەری روژ بێته ڤیواری
بەری هێلین ڤالا بن
بەری پاله هشیار بن
من و سێدارێ ژڤانه !!

★ ★ ★

سبه دایێ ..
کەڤرو تراش و بەفرو خوین
ئەو دلبەرا منا تورین
دێ دەست ستویێ من وەرینیت
دێ فرین چینه ئاسمانا
هەمی چیا
هەمی دەریا

سەرئەڤراز دێ دەستێت خو بو مە ڕاگرن
دێ هێنە خـار
روژو بوهـار
تاڤیەکا بارانا پیروز
بو چەند مێرگێت « ناپالما »
کرینە ڤێر ...
هێلاین بەیـار

★ ★ ★

سـبە دایـێ ..
پێلاڤا من .. ژ تاجا میری بلندترە
داوەتـا مـن ..
ژ هەمی گوڤەندا خوشترە
بەژن و بالا من ژ بوهارێ بخەملترە
ئەڤجا چەوا دێ کەی گری
سینگێ خویێ تەمەت دەریا
دێ ڤەقوتی
پرچا خویا وەکی بەفرێ دێ ڤەچڕی
نەدایێ نە .. نەکەی نەکەی
جلو بەرگێت خو ڕەش بکەی
دەرگەهێ کولکێ مەیێ خوش
بو خەمو نیهارا ڤەکەی

سبه دایێ ..
( خانی ) دێ سەرکێ زاڤای بو من بێژیتو
تو ڤەگێرە
سبه دایێ نەکە گری
هەمی زەریێت گوندێ مە دێ هێنە ڤیرە
گەر دوو روندك ژی بێ‌دەستی
ژ هەر دوو چاڤێت تە کەتن
تو خودی کەی زوی ڤەشێرە
دا یارا من نەبێژیتن :
« لاوێ من مر
ئەو تڤەنگا ددەستادا
مزگینی دلویلیێرا ژەنی
دیسا ل کوچکا سولتانی
دێ بیتە ئێخسیرو بەنی »
ئەڤجا رابیت .. ئەو کراسێ
ژ سەرێ کوپا ..
ژ داڤێت روژێ
من بو ئینای ..
د شەڤێ ڤەدەت .. بکەتە تەنی ..
نە دایێ نە .. نە یارێ نە

# ملەکەوە

ئەژی گۆران

— دڵی منیش وەك تۆی لێ دێ ••
هەڵئەقرچێ •••
[ بەیانی چۆن بەلاتا بێم ؟!••• ]

— بە دیوی نسێی ئێوارەی دەم بنارتا هەڵمبخە •••
با ئاونگی ئەم بەهارە لە کوێستانا ، لە خۆڵەکەوەم بنیشێ •••
[ ئەم ئارەقە ساردە چیە •••؟ بە هاناما تك •• تك دەرژێ •••]

— ئەمشەو لە بن پەراسوٚکانمەوە ••
دوکەڵ دێتو ، لەسەر تەوێڵم لوول ئەبێ •••
[ دە تــف ! لە تەختی تەوێڵێ ••
نەبێ تاوێ هەناسەی ساردی نازدارێ یەخەی بگرێ ••• ]

— ملەکەوە : ئەم رێ قیرەی بەسەر دڵتا گوزەر ئەکا •••
لەناو دڵما ئەتوێتەوە •••

— دەمێ بارگەی کۆچەرێیە •• دەمێ کۆچ ئەپێچێتەوە •••

ئەم کۆچەڕێیە لە دڵما ، گەرمیان لە کوێستان دائەبڕێ •••
یا لەسەر چەقی ئەم ڕێیە •• گەرمیانو کوێستان یەك‌ئەگرێ •••

— تینوی شەپۆلێکی پرچەکەتم •• دڕوی ئەم لێوانەم پاراو بکا •
ئای لەم بنارەدا کۆچی بێ‌سەرو شوێن •• چی بە چاوەڕوانی ئەکا••
[ ڕنوی بەفر جێ ژوانو چاوەڕوانی دائەروخان ]

— دە بۆ نایەی سەرێ بدەی ؟!•••
چڵو چێوی چاوەڕوانی لەژێر پێتا قرچە ئەکا •••
چڵو چێوم •• بۆنی بەفرو ، تەڵی وەنەوشەی خەم ئەکا •••

— بۆ نەهاتی ؟•• ئەگەر حەزت لە بۆنی سوێسنەی بەهارە
[ ئەم بەهارە •• دڵداری بۆتە کۆچو ڕەو •• لە بنارا ••
دڵدارەکان : جێ‌ژوانیان بۆ سوێسنەو پەرژین چۆڵ‌ئەکەن ••
رازو نیازیان •• بەسەر تووترکا هەڵ‌ئەخەن ••• ]

× × ×

[ لەم نزارە زەبەنگەدا ئاونگ تەنیا روی تۆ ئەگرێ ••]

— کەی شنەی (با) ئاونگی دەمەوبەیانی•• لەسەر گۆناو لێوت تکان•••؟
ئەزانی ئێستا لە باخو بەراوی گوندە چۆڵەکان •••
فڕەی باڵی پەپوولەیە ، لەسەر لێوی گوڵو گەڵا !••

— دامەمێنە ! ئەگەر پرسیار چرۆی پشکوتوی خەم بگرێ ••
ئەگەر خەمم نەبێ گیانە •••
بۆچی دڵم •• بۆ دوری تۆ شیوەنێکیوا ئەگێڕێ •••
[ پەپوولە خۆی لە گوڵ ئەگرێ ••

بڵێی شنەی ئێوارەیە •• باسی تریفەی بۆ بکا ••• ]

— ئەوەتا من لە خەڵوەتی عەشقی تۆدام •• دە بۆ نایەی
کەشکۆڵەکەم هەڵرێژیتو •• خەرقەی بەرم لەبەر بدڕی ••
کەشکۆڵەکەم هەڵرێژیتو •• خەرقەی بەرم لەبەر بدڕی ••

× × ×

— من لەسەر شانی خۆمەوە •• پێستی ئەم لەشە هەڵئەدرم ••
گیانم بەسەر شانی تۆدا هەڵئەفرێنم ••• ملەکەوە !

— بەسە لە ترسی ئازاری دەستو پەنجە •• ئەوەندە گیانم داخورپێ ••
[ بەکوێدا دێی وەرە پێشێ •• با تارمایەکەت ببینم ]

— ئەوەتا دێم •• لە هەر کوێیە گیانم دەرچێ •••
بۆلای تۆ دێم •••

— بەیەکەوە دەست ئەگرینو ، لەسەر دەمی داستانێکا •••
بۆ دڵداری بنارە •• ئەبینە خەجو سیامەند ••• ئەبینە مەمو
خاتو زین •••

× × ×

ئای ! لەم بنارەدا ملەکەوە !•••
چەند ژنی جاف ژان ئەیگرتو •••
چەندی لێ بەراویتە ئەبو •••

— من لە پشتی باوەلیما نوتفەیە بوم •••
دەسرازەیەکی بەنیان نیشاندام ••

لەگەڵ قۆچکەیەکی لە جاو دوراو •••
کە لەسەر چەم ، ناوکیان بریم •••
ماسیە گەورەکانی دەریا •• هاتن ناوکە بڕاوەکەیان لێ دزیم •••
[ ئای لە چاوچنوکی نەهەنگ ••
ئەشێ پەتکی ناوکی کوردێ بو کلۆری دانی بشێ ]

— دەستم بەندی دەسرازە بێ •• سەرم لە قۆچکەی جاوا بجەرێ •••
من لە بەرۆکی ئەم کەژە دەست هەڵناگرم •••
هەتا بتوانم هەڵزنێم ••
ئەگەر نەگەم ماچی لێوی رەوەز بکەم •• با هەڵدێرێم ••
بەسەر سنگ‌و بەرۆکی تۆدا هەڵخزێم •••

— من لەسەر شانی خۆمەوە پێستی ئەم لەشە هەڵئەدرم
[ بازی ] گیانم بەسەر تۆدا هەڵئەفرێنم ••
پەری زادەی شاری هیواو خۆزگەکانم •••

١٩٨٠/٣/٢٣

---

ملەکەوە : شاخی ملەکەوە
دیوی نسێ : دیوی سێبەری دوای نیوەڕۆ
خوڵەکەوە : خۆڵەمێش
تەوێـڵ : ناوچەوان
دڕو : ئاودڕ
بەراوێتە : بەرخستن
باوەلێ : باپیر
نوتفە : تۆوی پەیدابونی مرۆڤ

چیرۆك

# لە بار جووت

سلیمانی ـ جیهان عومەر

شەو باوەشی تاریکی لە بێدەنگی ئەوەوە ئاڵاندبو •• شێی تەری پایزیکی درەنگ مەڵاشوی تینویەتی ژورەکەی تەڕدەکرد ••• کزە بایەکی دزراوی سووچەکانی پەنجەرەکە ئاوازیکی سەماکردنی گڵۆپی بنمیچە داری یەکەی ژورەکەیان بو • بۆ چەند جاریك سەری لەژیر لیفەکە وەدەرهاویشت بۆ هەڵمژینیکی هەوای پایز •• لەئەنجامدا منداڵەکەی هەرەسی بە بێدەنگی یەکەی دەهیناو دەکەوتە پاڵەپەستوی ورگیو قاچی لەمسەرو ئەوسەری منداڵدانی توند دەکرد •• ئەویش ناوچەوانی گرژی ئازارەکەی لە زەردەخەنەیەکدا دەپچراندو ••• پەنجەرەکەی بەتەواوی جووت دەکرد •• دەگەرایەوە جیگاکەیو بیرکردنەوەکەی دەخستە پاشکوی کاروانەکەی میردەکەی کە بوە هوی نەگەرانەوەی •• لەپڕیکا قسەکانی ئەوان دەیهاژانەوە ناو شەپولی دوودڵییەوە ••

— تۆ بڵییت بگەریتەوە •

— کاروانە گەرانەوەی بۆ نییە •

— ئەی ئەوان دەڵین دەگەریتەوە •

ــ قسەکانی ئەوان گەندەڵە •• ناگەڕێتەوە ، •• برای خۆمەو دەی ناسم •

ــ چــون •

ــ سەریکەو بردویەتی بۆ نەگەرانەوە •

شانی ئاڵو گوڕ کرد ،•• سکەکەی ئازاری دەدات •• جاران کە سکی لە میردەکەی کەی پڕدەبوو ئەم ئازارەی نەدەچیژا •• بزوانــدنی ئەم منداڵە لەئەنجامی جووتبونەکانی ئــەمە کە تامەزروی بوورانەوەیەکی کاتی بو ••

ئەویش ڕوی کردەوە ئەو ، دەستی لەژیر ملی ناو باوەشی ئارەزوی پیاکردەوە ، نەرمایی ڕانەکانیو بەرزایی سەکۆی پاشەوەی لە ئەلحەدی بەرزی ناوگەڵی ئەودا کەوتە پاڵــە پەســتوی جوڵــەی دەمارەکانی ••• ئەویش هەڵگەرایــەوە بەودیــوداو بەرزیی ورگــی کردە دیوارێــکی جیاوازی لەئاستی ئــارەزوەکەی ئەودا •• ئەو ئارەزوەکەی کوژاندەوە بــە چەنــد بۆڵەیــەکی شاراوە •• ئــەویش بــۆڵەکانی ئــەوی لەئاستی بیرکردنەوەکانی خۆیدا پێچایەوە :

ــ ئەی ئەگەر گەڕایەوە بڵێین چی ؟

ــ ئێمە کاری ناشەرعیمان نەکردوە •

ــ چون ؟!

ــ ئایین دەڵیت پاش حەوت ساڵ شوکردن دروستە •

ــ ئەی ئەگەر ئەو ••

ــ ئەو هیچ نیە •

ــ چون ؟!

— ئایین ڕێگای نادات •

— بەڵام من ڕێگای دەدەم •

قسەکانی بە گری‌یەك لە دەمارەکانی میشکیدا گیری خوارد •••
دەیویست لەگەڵ دوکەڵی جگەرەیەکی تەنیایی چارەسەرێك بۆ
گەرانەوەکە بدۆزیتەوە ••• بۆ منداڵ بونیکی نوی ، •• هەروەها
پێویستە دواڕۆژیکی رووناك بۆ ئەو منداڵە بدۆزیتەوە کە هێشتا ڕووناکی
بەدی نەکردوە ••• ، ئەی ئەنجامی سەرزەنشتی براکەی هەندیك جار
سەرئەنجامی بۆ ئەوە دەنوسێ کە چاکەی لەگەڵ براکەی کردوە لەپێناوی
خیزانەکەی و ماڵەکەیدا ••• جاریکی کە هەڵگەرایەوە بەلای ئەودا ،••
دەستی درێژ کرد بۆ لاڕانی ئەو ••• ئەو خۆی لی‌ی دورخستەوە ••،
ئەم حەزی لە دامرکاندنەوەی دەمارەکانی خۆی دەکرد لە شەوەزنگیکی
یەکتر نەدیودا ••• ئەویش نەی‌دەویست بیرەکانی خوی لە ئارەزویەکی
ئەودا بپچڕێنێ ••• کەوتە ئەوەی کە پێویستە بیربکاتەوە لەوەی
منداڵەکەی لەبارخۆی بەریت ••• ، بەڵام لەباربردن مانای تاوانە ••
کوشتنی منداڵیکی نوی لە باوەشی ماڵەکەیدا •••، منداڵەکە جاریکی کە
سەری لە ورگی توند کردەوە ،••• ئەو خوی بۆ هەڵگیرایەوە •• چاویکی
ئازاری لە یەك نا ••، حەزی بە هەڵمزینی هەوایەکی دەرەوە دەکرد ••
خەریکە هەناسەی سوار دەبێت،•• ئەو ، کەمێك لی‌ی هاتەوە پێشەوە ،••
ئەم خوی کێشایەوە بۆ دواوە ،•• بۆ جاریکی کە پەنجەرەکەی یەکالا
کردەوە ••• چاوەکانی لە دوا نوختەی ڕێگاکە توند کرد •• شارەکە لە
تاریکی‌یەکی بێ‌دەنگدا چاوەکانی نابوە سەریەك ، •• گڵۆپەکان بە
کزی‌یەکەوە چاوەڕێ ڕۆژێکی ڕووناك دەکەن ••• لەبەر خۆیەوە :

— دەگەڕێنەوە ••

— چار چی‌یە •

بێدەنگی میوانی چاوەڕێ‌کردنەکەی بو ،•• ئازارەکەی بەرو زیاد کردن دەچوو ،•• کەوتـە هاتـوچۆ کردن ••• چاوەکانی دەنایە سـەر یەك بۆ لەبیربردنەوەی ئەو ئازارانەو لەپیناوی منداڵبونیکی نوی‌دا ••• گلۆپەکەی هەڵگیرساند ،•• ئەو بە زوویی کوژاندی‌یەوە ••• کەوتـە ژانبژاردن ••• دانەکانی لە یەك جووت دەکرد •• ئازارەکانی لەژیـر زمانیا دەجوەوە ،•••• زیاتر دانی لەو ئازارانە جووت‌کرد •• دەی‌ویست هاوار بکات ،•• شەوەزەنـگەکە زیاتـر ترسی بـەو ئازارانـە دەدا ••• ئەویش خوی لەبەر ئازارەکاندا گرتبو ••• زەویش خەریکی داماڵینی تاریکی شـەو بو ،•• ئەویش ئافرەتـی گەڕەك بەدەنـگ ئازارەکەیەوە هاتن ،•• دانەکانی دەنایە سەر یەك •••

— سلاوەت بـە •

بە یەك‌دەنگ ئافرەتەکان سلاوەتەکەیان بۆ دەسەندەوە ،•• ئـەو چاوەکانی لە یەك دەنا •• گوپەکانی پڕ دەبوون لە هەوا ••• دانەکانی لە ئازارەکان توند دەکرد ••

— ئەمە سەری چەندهەمین ژانە •

— نازانـم •

پرچەکانی خۆر لوتکەی چیاکانیـان گرتـە بـاوەش ،•• تاریـکی هەڵهات‌و ڕووناکی ڕۆژەکە لە ڕۆژیکی نوی‌دا جی‌گیر بو ،•• ئەویش دوا ژانی سەرژمیر کردو ، واقەی منداڵیـکی نـویێ لـە کولانـەکانی گەرەکەکەدا دەنگی دەدایەوە ،•• ئەویش چاوی ئارامی لە زەردەخەنەی سەر لێودا ئارامگاکرد •

# بڕووخێن ئەی دیناسۆرەکان ..
# بڕووخێن !.

**( لاپەڕەیەك لە تاوانی خوێنرێژەکانی گەلانی ئێران ) •**

**نــاصر حفید**

دە سەرکەوەو قۆنەرەکەت
لەگەڵ سەری جەللادەکەت جووت کە •
جەللادەکەت دیناسۆری ئەم چەرخەیە
هەموو ڕۆژێــك
کە برسێتی داگیرکردن ئەیجووڵێنێ
لایەك لەم شارە ئازایە ئەڕووخێنێ
تۆ سەرکەوە
سەری دیناسۆر بچکۆلەیە
سەری بچووك
سەری لەشی گەورە ئەخوات •

× × ×

شاعیرەکان هەموو ڕۆژێك

دڵدارێکیان لە دار ئەدرێت
پەنجەرەیان لەسەر خەمی
هەموو جیهان کردۆتەوە •
ئاواز بۆ مردن دائەنێن
پێش کەوتنە
لەسەر مردن پێش کەوتنە
ئەڵێن لەناو گریێی پەتدا
لەگەڵ تەقـەی
جیابوونەوەی سەرو لەشدا
چڵی گزنگ دائەگیرسێت
چڵی گزنگ هەر هیچ نەبێت
سەرێك ڕووناك ئەکاتەوە •
ـ دایـە بۆچی ،
دایکەکانی ئەم گەرەکە
وەکو تەختەی قوتابخانـە
خۆیان لە ڕەش هەڵکێشاوە !؟
ـ رۆڵە ! ئەوە کوڕەکانیان
لەسەر سنگیان نووسیوە
ئەمانەوێ هەناسە بەین
ئەمانەوێ خۆمان خاوەنی خۆمان بین
ئەمانەوێ هەر دڵدار بین
ـ بنوو رۆڵە •
ـ دایە بۆچی ئەمشەو لوورەی گورگ نایەت •
ـ رۆڵە ئاخۆ دەمیان لە جەرگی کێ ژەنیوە

دیاره • قوماش له بازاڕدا ماوەتەوە
ئاخۆ چ خاوەن کارگەیەك وا خەریکە
زیانی لێ ئەکەوێت •
ـ دایە نانووم •
ـ ڕۆڵە مەنوو •
با ڕیسوا بێت ئەو جەللادەی
وانەی ترس دەڵێتەوە
دە تۆش هەستەو کراسێکی ڕەشی سادە ،
بۆ ئەم دایکەت بنێرەوە •
ئای کە ئەم زیندانە تاریکە
ڕووناکایی زۆری تیایە •

چیرۆك

سەلام مەنمی

(١)

جارێکی‌تر قات‌و قڕی بەرۆکی گوندی چنارەی بەردا •• باری خواری ڕاست بۆوە •• بەسەر ڕۆژگاری ڕەشا زاڵبوو •• مرۆڤەکانی دەستی ماندوویان لەسەر سکی تێر دانا •• هەرەوەزی جووت دەستی پێ کردەوە •• باڵندەکان هێلانەکانیان دۆزی‌یەوە •• ئاژەڵەکان دەمیان نا پاوەنەکان •• چیاکان بەدەم چالاکی لاوەکانەوە ئەخەنینەوە ••

( مام ناوخاس ) پیاوێکی بەتەمەن‌و خاوەن ئەزموون بوو •• دوای ئەو هەنگاوە پڕ لە مژدەیە ، دەستێکی بە ڕیشە **سپی‌یەکەیا هێنا** ، لاوەکانی کۆکردەوەو وتی :

ـ کوڕینە دوای ئەوەی گوندەکەمان لە خەوی چل ساڵە ڕاپەڕی‌و بەستەڵەکی زستانی شکان ، ئارەقی شەرمەزاری ڕشت ، حەزئەکەم نهێنی‌یەك هەیە پێتانی ڕابگەیێنم ، نهێنی‌یەك پێوەندی سەرومڕی بە گوندەکەمانەوە هەیە •• ئەوەیش ئەوەیە ئەم گردە بچووکەی لەنێوان ئێمەو گوندی (میر)دایە کانی‌یەکی گەورەی تیایە •• کاتی خۆی کوێرە

کانی بوو •• مام وەیسی باپیرە گەورەمان هات کارێزی لێدا ••
سەرێکی قایم ئاوی لێدەردەچوو ، ئاودێرم ئەویست بیگێڕایەوە
هەڵیسووڕانایە ••• بەڕاستی جێگەی خۆشبەختی گوندەکە بوو ••
باری لەشیان سووك بوو •• بەڵام میرەکانی گوندی (میر) ئەوجا دەستیان
ئەڕۆیشت •• بە هەموولایەکا هەڵپەیان بوو •• لە زۆرداریو گەنەخۆری
کۆیان نەئەکرد •• هاتن لای خۆیانەوە گردەکەیان کەندڕ کردو دەستیان
نایە بینی کانیو ڕوویان کردە گوندەکەی خۆیان ، لەژێر فەڕی کانییەکەدا
سمێڵیان قیت کردەوە ، ناوەکەیان گۆڕیو ناویان نا کانی (میر) •
مام‌وەیس هەرچەند پیاوێکی عاقڵو لێهاتوو بوو •• بەربەرەکانێی
کردن •• بەڵام کەس نەبوو پشتی بگرێو بەتەنیا مایەوە •• چەپڵەیش
بە یەك دەست لێنادرێ •• هەر بەوداخەیشەوە سەری نایەوە •• ئەمەیش
ئەو وەسێتەیە بۆ ئێوەی بەجێ‌هێشتووە : ( لاوەکانی دواڕۆژی چنارە من
یەکەم کەس بووم ئەم کانییەم ئاوەدان کردەوە ، کارێزم لێدا ، خەڵکەکە
لەخۆشییانا ناویان نا کانی مام‌وەیس • بەڵام ڕۆژگاری ڕەش بەرپێی
تاریك کردینو وەك مۆتەکە بینی ئێمەو کانییەکەی گرتو لە ئێمەی
جیاکردەوەو بە جێگەیەکی نائاساییدا دایشکان •• من ئەمرم ، بەڵام ئەو
سوورە چنارەی ناشتوومە ئەمێنێ •• بۆیە ئەڵێم ئەمێنێ ، چونکە باپیرانمان
وتوویانە لە زیندەوەردا کیسەڵ تەمەنی زۆرە ، لە درەختیشا سوورە
چنار •• ئەگەر دایشیبپاچن بنە کۆتەکەی هەر ئەمێنێتەوە • ئیتر خۆتانو
شیرتان ) •

لاوەکان چاویان پەڕییە پشتی سەریان ، هەریەکە لای خۆیەوە
ئەیوت :

— ڕۆژ لەمڕۆژە باشتر نابێ •
— هەرگیز وا یەك نەبووین •

— هەتــا زوە بیگێڕنەوە •
— من بیستبووم بەڵام بڕوام نەئەکرد •
— ڕاست ئەکات چنارە هەر ماوە •

(٢)

پاچو قوڵنگیان هەڵگرت • لەودیوی کەوتنە بن کەن کردنی گردەکەو گەیشتنە ناوەڕاستی •• خشتێکیان دۆزی‌یەوە کە مامەویس بە دەســتی خۆی دایناببوو •

لە دەوری خشت کۆبوونەوە ، چالاکی‌یان باشتر بە ژنو پیــاوەوە ئارقیان ڕشت ، گەیشتنە ئاو ، دەستیان نایە بینی کانی •• جۆگەیان بەرەو چنارە ڕاکێشا •• بە دەشتی خوارووی گوندەکەدا ئاو قەڵبەزەی بەست •• خەڵکەکە گۆرانی‌یان بە ڕابووردووی مامەویس‌دا ئەوت : ( قوڵنگەکەی مامەویس هەر ماوە ، لاوەکان پەیمانیان داوە ، ئەگەر سەریان داناوە بــە بێ‌کارێز نەیەنە دواوە •• ) •

ناوخاس چووە لای چنارەکەو تێر ماچی کردو ڕووی کردە خەڵکەکە:

— گوندی میر ئەکەونە مقۆ مقۆو ئەڵێن ئەم کانی‌یە هەرگیز وشــکی نەکردوە •• ئەمە چ‌بەلایــەك بوو یەخــەی گرتین ، پیرێــکی کەتە لــە میرەکانی گوندی (میر) ماوە ناویشی (میرخان)ە پی‌یان ئەڵێ گوندی چنارە لەم‌دوایی‌یەدا ناوی خۆیان بیستۆتەوە ، هەر ئەوانن •• ئەم کانی‌یــە لای ئەوان ناوی کانی مامەویسەو بە هی خۆیانی ئەزانن •• بەڵام دەست لــەم کانی‌یە هەڵناگرین •• ئەوانیش بە قسەی ئەکەنو پاچو بێڵ هەڵ‌ئەگرن هێرش ئەبەن ، بەڵام کە سەیریان کرد هەموو بن‌بەردێ جەنگاوەرێکی لێ‌یــە دەستەویەخــە وەســتاوە ، بەشەرمەزاری‌یــەوە ئەگەڕێنــەوە •• ئاوەکەیش هەتا بێ بەرەو چنارە بەخوڕی ئەڕوات •

# وشە ئاڵۆزاوەکان

**دایکی سۆلاف**

لە گەنجینەی کاسەی سەرما
چەنــد وشەیــەك
هاتن‌و چوون ، ئاڵۆزابون
ئەگەڕان بۆ ناوێکی خۆش
خۆیان نــاو بنێن
دامــابوون

× × ×

هەریەکە ناوێــکی دانا بۆ ئەوی‌تر
ناوێــك وەك خۆر گڕاوی بوو
نەك ساردو سڕ

× × ×

ناوێك وەك ئاسۆ ڕوناك بوو
مژدەی هــانی

سرودێـك لەناو سزادا
هەستایە پێو هاواری کردو
نـالأنی

× × ×

بۆ دامێنی هەر سێ وشە
نووشتامەوە
کرنووشم برد بۆ خوای ئاشتی
بۆ فەلەستین بۆ مەهاباد ، بۆ تەل زەعتەر
پـاڕامەوە

× × ×

مەلی هیوام جریوانی
بە گوێی کپو نیوە کەڕما
بەسەر لاشەی بەندیخانەی
کاسـەی سەرمـا

× × ×

ئەو وشانە سێ ئەستێرەن
لە باوەشی شەوی قینا
ئەگرین بەسەر مێژووماناا
بەسەر تەرمی خۆری ژینـا
بەسەر دوێنێو ئەمڕۆمانا
بەسەر ئـاگری نەورۆزا
بەسەر هەواڵی ئـاڵۆزا

× × ×

داستانەکەی مەمو زینە
کزەو سۆزو
یادی تیایە
خۆشەویستیو ڕقو خۆزگەو
نائومیدیو مەرگی تیایە
بەستەکانی ڕۆژگارمانە
پڕ لە نالەو ئیشو ژانە
گزنگیکە بەرامبەر لانەوازیکە
لاوکیکە لەسەر لیۆ نیازو ڕازێکە

× × ×

پێشەنگەکەی چرایەکە هەڵکراوە
ناکوژێتەوە
پەیامی ئەو وشانەیە
هەتا دوایی هەر زیندووە
ناسڕێتەوە
دەریایەکە هەتا بنەکەی بەستویەتی
هەرگیز هەرگیز
ناتوێتەوە

× × ×

مەشخەڵێکی تیکۆشانە
کاروانیکی ڕێگەی سەختە
وەیشومەیە
سەر بەرەوژور لە **کێوانە**

× × ×

قورئـانەکەی محەمەدو
ئاوێستاکەی زەردەشتو
ئینجیلی عیسایان پێیـە
سڵاو ئەکەن •• هەزار سڵاو
لەو بەهارەی کە کێلگەکان
تیر ئـاو ئـەکا
سۆزی فرمێسکی بەخوڕمان
هەر ئەبارێ •• هەر ئەپرژێ
تا هەموو جیهان تەڕ ئەکا
شریخەی وشەکانمان
گوێی شەڕپەرستـان
کـەڕ ئـەکا

# باخی قەرەبرووت

جەزا عەلی ئەمین

ئاوازەکەت دەڕژێتە سەر دەشتی (با)و
فوودەکا بە ڕۆحی تەنیاییما
گیانم ڕەوە پەپوولەیە ،
بە باڵای سووتاوەوە باڵ دەکوتێ
چەند حەزدەکەم دەنگی تۆ بێ‌و
پەپوولەی گیان یەك بەدوای یەکا بسووتێ

× × ×

باخی قەرەبرووت گیانمە
ئەگەر کەسیش وانەزانێ
خۆ بۆ خۆم چاکم چاو لێیە
لەوەتەی هەم باخەوانی ئەو باخەم‌و
بەدیاریەوە سەری هەنسك هەڵدەدەم
— ئەی ئەو وردە ئاونگانەی لە ناخڕا دێن
بتکێنە سـەر زەوی گیانم

مەگەر ئێوە ، بەدەم سروودی توانەوەی خۆتانەوە دایپۆشن
شوێنەوارتان ، پەڵە گوڵاڵەی وا بێنێ
لەپێستمەوە بێتەدەرێ !
مەگەر ئەوسا چاوە لێڵەکانی منیش
سوورایی‌یان لێ بتۆرێ

× × ×

+ ئەوا هاتین ، ئەوا هاتین !
قەتارەی ئاونگی سپین
خۆمان دەخەینە بەر (نواڵەی) (۱) خۆرەتاوی دەرووونتەوە
ڕەنگە ئاڵەکەی وەردەگرین
بە باخە سووتاوەکەی گیانت بڵێ :
وەڕێکەوتین ، وەڕێکەوتین

**٤ی مایس ١٩٨٠**

---

(۱) (نواڵە) : خەرمانە بۆ مانگ چۆنە ، نواڵەش بۆ ڕۆژ وایە ..

# منداڵەکان و تابلۆکان

محمد رشید فتاح

ئەو رۆژەیان لە رۆژانی‌تر نەدەچوو • نە بە سەر گوریسەکەی پەلکی دار گوێزەکەی ژوورسەریانەوە گوژمیان دەداو ، نە چاوی گەشی ئاوەکەی جۆگە شینی نزیکیشیانەوە لێڵ دەکرد • سەریان پێکەوە نابوو ، گوێ‌رایەڵی وتەکانی نەبەز بوون •

لەوبەریشەوە مام خدرو ، برایمەو ، سمایل میوانی سێبەرە پەرش‌و بڵاوەکەی دار قەیسی‌یەکە بوون •

مام خدر کەمێك لاڕانی هەلکڕاندو لەسەر قسەکانی رۆیشت •

— سوور لێم مەعلومە •• ئەم حاجی بابەشێخەش بەقەدەر ئێمەومانـان چارەی ئەم مێردەزمانەی ناوێ ••

برایمە •• راستبوەوەو ، قنج‌و قیت وەك کەیفی بەم قسانە بێت ، چوارمەشقی لێ‌ی دانیشت •

— قسەیەتی •• ئۆباڵ بە گەردنم قسەی مام خدرە •• حاجیش وەك ئێمە بەدەست ئەم جانەوەرانەوە گیری خواردوە ••• ئای چەنـد خەفەتی بۆ ئارامی حەمە مراد خوارد ••

بزەیەك بە رووی سمایلەوە لکا •• لەوجۆرە بزانەی کە بەمانـاوە رودەگرن •

ـــ ئەوە ئێوە دەڵێن‌چی ؟ حەکایەتی چیم بۆ دەکەن ؟ مەسەلەکە لە چاوی ئاوەکەی جۆگەشین رونترە •• ئارامی حەمە مراد بەدەستی ئـەو زاڵمانە لەناوچوو •• حاجیش هەر داردەستی ئەوان نیە ؟!! •

مام خدر بە توورەییەوە بەسەریاخوڕی •

ـــ هەتیو فڵتە فڵت •• کەواتە بە قسەی تۆ بێ •• بابەشێخ ئاگای لـە ونبوونی ئارامە ! •

ـــ ئەرێ وەڵلا •• من هەر وا دەڵێم ••

برایمە جوڵەی پێکەوت ، ئەملاو لایەکی بۆ کردو ، لەسەرخۆ وتی :

ـــ دەی سمایل قوڕمان بۆ بگرەوە •• هەتیو دەسـتگرە بـە کـڵاوی خۆتەوە با نەیبا •• پیاوی چا بە تووشمان مەکە •

ـــ من وەك ئێوە ناترسـم •• نەوەڵـلا •• نـە زەویـم هەیـە •• نـە ماڵات‌و •• نە بڕە دارێك •• چی راست بێ ئەوە دەڵێم ! •

ـــ ناترسی دەی گەر کوڕی باوکی خۆتی لە خەرمـانەکەی ئیمسـاڵت سەری خۆت مەقەبڵێنە ! •

مام خدریش فرسەتی هێناو قسەیەکی تێدا کرد ••

ـــ راست‌ئەکا •• ئەرێ‌وەڵلا برایمە قسەیەتی •• گەر ئازای سمایـل سێ‌یەکی خەرمانەکەت مەدە بە حاجی بابەشێخ !! •

سمایلە بە کزی‌یەوە وتی : ـ بڵێم‌چی •• گـەر وەك ئێوە پارچـە زەوی‌یەکم شك دەبرد •• ئەوا هەرگـیز رەنجی خـۆم دەرخـواردی حازرخۆری بەرسێبەر نەئەدا !

برایمە رەنگی پەڕی‌و ، خێرا باسەکەی گۆڕی •

— خزمینە •• ئەوە بۆ وا ئیمڕۆکە منداڵەکان بێدەنگن ؟ •

سمایل هەڵی‌دایـە ••

— چی‌بکەن لەناو ئارامی هاوڕێیان بێ‌تاقەتن ! •

برایمە لە جێی خۆی بەرزبوەوەو ، رووی لە مام خدر نا •

— مامە ئەڵێم •• وەختی نوێژە •• نەڕۆین ؟ •

مام خدر راست‌بوەوەو ، دەستی نایە بەر ئەژنۆکانی‌و ، رووی کردە سمایل ••

— کوڕەکەم •• هەر ئەم حاجی بابەشێخە لە مامۆستاو •• سەرڕوتەکانی شار راسترە •• بۆیە پێت‌دەڵێم گوێ لە قسەی ئەم بگریت‌و ، واز لە چەنەبازی ئەوان بێنی چاترە ! •

سمایل پێی‌وت :ـ بەلای تۆوە وایە •• چونکە تۆش خاوەنی هەمو شتێکی •• بەڵام من •!•

برایمەش وتی : ـ توخوا واز لەم قسانە بێنن •• ئاها •• بـا بچینـە مزگەوت‌و ، رووبکەینە قاپی ئەو چاترە ! •

سمایل دویان کەوت •• مام خدریش دەنگی منداڵەکانی دا •

— کوڕگەڵ بەرەو ماڵ بنەوە •• ها کا مێگەل گەڕایەوە •

وشیار بەر لە منداڵەکانی‌تر •• وتی :ـ باشە هەر ئێستە دێینەوە •

ئەوان لەچاو ون‌بوون ، ئاواتیش رووی‌کردە نەبەز •

— با بچین •• شکور رۆیشتن •

پێکەوە ملی تولەڕێیەکەی ناو باخەکەیان گرت • لە تەیمانەکەوە وەدەرکەوتن‌و ، بەرەو گردە قوتە ملیان نا •

وشیار لە نەبەزی پرسی :ـ ئەم حەلانە بوو •• لەگەڵ ئارامدا چوون؟•

ـــ ئەرێوەڵلا ئەم حەلانە بوو •

ـــ باشە ئارام چی‌ی وت ؟ •

ـــ وتی •• نەبەز با بچین بزانین ژوورەکەی ئەو زەلامـانە بـە گردە قوتەوە چی‌ی تیایە ؟ •

ئاوات لە نەبەز چووە پێشەوەو ، لێ‌ی‌پرسی :ـ باشە چی تیا بوو ؟ •

ـــ ئەی پێم نەوتن •• پڕی بوو لە ڕەسمی گەورە گەورە •• وشیـار ڕەسمێکی تیابوو زۆر سەیر بوو •

ـــ چی بوو ؟ •

ـــ دارێکی زل بوو •• هەر لە دار گوێزەکەی ناو باخەکە دەچوو •

سووتابو •• فەقیرە •• ڕەش بوبوو •

دلێر سەری لێ بردە پێشەوە •

ـــ ئەی جۆگەشین ؟ •

ـــ ئا •• وابزانم •• وشك بووبو •• ئاوی پیا نەدەرۆیشت ! •

وشیار لێ‌ی پرسی‌یەوە :ـ ئەی ڕەسمەکانی‌تر ؟ •

ـــ بیرم‌کەوتەوە •• ڕەسمێکی‌تریان •• کۆمـەڵێ خـانوو بـوو ! • وابزانم •• ڕوخابوون ! •

ـــ ئەی زەلامەکان لەوێ نەبوون ؟ •

ـــ با •• چونکە ئارام بەسەر پشتمەوە هاواری کرد •• نەبەز دام‌گرە•• ئەو زەلامە لە ژوورەوە چاوم لێ بز ئەکاتەوە •

دلێریش خێرا وتی : ــ سا بە خوا هەر ئەو زەلامانە ئارامیان فڕاندووە ! •

ئاواتیش قسەکەی دلێری سەلماند ••

ــ راستە •• بەخوا منیش هەروا دەڵێم •

لە گردە قوتە نزیك کەوتنەوەو ، چەشنی مێرو پیایدا هەڵگەڕان •

لە ناکاوێکدا پێکەوە لایان لە ئاواییەکەیان کردەوە •

خۆرەتاوەکە بە رووکاری چەپی ماڵەکانەوە زەرد دەچووەوە •

باڕەو بۆڕەی مێگەلەکە خۆشی‌یەکی پیرۆزی رژانـدە نـاخی هـەر یەکێکیانەوە •

هەر ئەو خۆشی‌یەش گوڕی نایە بەریان‌و، بە گردە قوتەدا سەرکەوتن •

گەیشتنە بەردەمی کونە بچوکەکەی ژوورەکە •• وشیار پشتی بـۆ نەبەز داناو ، نەبەزیش خێرا چوە سەر پشتی‌و ، سەری بە کونەکەوە نا••

لەپڕ راپەڕی‌و وتی :ــ ئەوە رەسمێکی‌ترە •

ئەوان پێکەوە پرسی‌یان :ــ رەسمی چی‌یە ؟ •

ــ رەسمی ئارامە •• وا بەو دارەوە •

ــ چی ؟! •

بازی دایە خوارەوەو ، بە پەشۆکاوی‌یەوە وتی :ــ با را کەین •• حاجی بابەشێخ‌و زەلامێکی‌تر چاویان لێ بز کردمەوە •

پێکەوە رایان‌کرد •• تا نزیکی ماڵەکان نەوەستانـەوە • دلـێر بـە هەناسە بڕکێوە پێ‌ی‌وتن :ــ بۆ باوکمانی بگێڕینەوە ؟ •

نەبەز وتی :ــ من بۆ باوکمی ئەگێڕمەوە •

وشیاریش هەڵی‌دایە :ــ ئاخر دەترسم لێمان‌دەن ! •

× × ×

بە پشتی ئوتومۆبێلێکی کەتەی ماندووەوە کۆکرابوونەوە •
ئوتومۆبیلەکە لە هەورازەکاندا تەقەتەقی پێدەکەوت و لە نشێوەکانیشدا
فرەفڕ ملی دەنا •

وشیار بە دو چاوی فرمێسك کڕ تیا کەوتووەوە ، لە بەردەم باوکیدا
بەرەو دوا دەیڕوانی • تا دووریش دەکەوتنەوە •• دارگوێزەکە ،
گوریسەکە ، چاوە گەشەکەی جۆگەشین ، نەبەزو ، ئارام ، لە چاوە
لێڵەکانی نزیکتر دەبوونەوە •

« خۆزگە ئەو ئێوارەیە نەبەزمان جێ نەهێشتایە • گەر ئێمەی لەگەڵا
بوینایە نەیاندەتوانی بیفڕێنن • ئەویشیان برد • هەر ئەوان بردیان • وەکو
ئارام بردیان • حاجی بابەشێخیش ئاگای لێیە • ئەوە نیە لە پێشی
ئوتومۆبیلەکەوە پاڵی داوەتەوە ، ئەڵێی ئاگای لە هیچ نیە » •

ئاورێکی لە باوکی دایەوە ، ئاوڕەکەی وەك جاران سۆزی تیا نەبوو ،
کینەی لێ دەتکا• بەتایبەتی کە سمێڵە زلەکەی و، جامەدانە ڕیشوەدارەکەی
کەوتە بەرچاو ، بزەیەکی سادە سەرلێوەکانی گرت • ئەودەمە کەڵەشێرە
کونجەکەی خۆیانی بیرکەوتەوە ، کە لە دەرەوە دەبەزێ و ، لە ماڵەوە
خۆی گیف دەکاتەوە ! •

ـ باوکم •• لە سمایلی باوکی نەبەز ناچێ •• ئای ئەو چەند ئازایە••
لەگەڵمان نەهات • خۆی شاردەوەو ، دوی نەبەز کەوت •

ئەو شەوەش هاتە کن باوکم و ، لە هەیوانەکەوە گوێم لێ بوو ، لێی
پرسی : ـ برایمە وشیار نوستوە ؟ •

ـــ بۆ ؟ •

ـــ بزانم •• ئەم ئێوارەیە نەبەزی منی نەدیوە ؟ •

ــ نەبەزی تۆ •• بۆ نەهاتۆتەوە ؟ •
ــ نەوەڵلا •• دیار نیە •
ــ خۆ منیش ئێوارە سەرێکی باخەکەم دایەوە •• لەو دەوروبەرەش نەمدی •
ــ بەراستە •
ــ ئەرێ وەڵلا •• تەنها بابەشێخو ، خولەی سەرکارم دی •• لە گردە قوتەوە •• بەرەو ئاوایی بە هەڵەداوان دەگەڕانەوە •
خۆم بۆ نەگیرا •• بە پێی پەتی •• بەرەو دەرگەی حەوشەکە رام‌کردو ، وتم :ــ کاك سمایل ئێوارە نەبەز لەگەڵ ئێمەدا گەڕایەوە ، ئیتر نازانم چیی بەسەرهات •
ــ لەگەڵ ئێوەدا ؟ •
ــ بەڵێ •• ئێمە لە قەراغ ئاوایی جێمان‌هێشت •

سمایل بە دڵشکاوی‌یەوە وتی :ــ باشە •• تێگەیشتم •• خوا حافیز • بڵێ بۆ راستم پێ‌نەوت •• خۆ باوکم نەی‌دەکوشتم •• بەلاّم قەی‌ناکا سمایل ئەوانو ، بابەشێخیش دەناسێ • وەکو باوکم نیە ! • »

ئوتومبیلەکە ملی دەنا •• کەچی دیمەنەکان لەپێش چاوی وشیار ئاوا نەدەبوون •

ئەوە •• ئاوە روونەکە •• ئەوە بارەو بۆرەی ئێوارانی مێگەلەکە •• ئەوە گوریسەکەو پەلکی دارگوێزەکە •• ئەوە •• ئەوە ••

خۆی بۆ رانەگیرا •• وەکو دیمەنەکان بەکێشی‌کەن •• لە ئوتومبیلەکە خۆی فرێدایە خوارەوە ، کەوتە سەر رێگەکە ، هەستی بە ئازار نەکرد •• هەستایەوە ، رایکردو ، ئاوڕی نەدایەوە •• هاواری کرد •• ئارام •• نەبەز •• منیش وا هاتمەوە •• هاتمەوە !! •

« بۆ ئەو دڵانەی لە بانەو سنەو سەرانسەری ئێران بە بڵێسـەی ئاگری ئازادی گڕیان گرتووە »

**جەمال محەمەد ئیسماعیل**

من نەمدەویست بۆ خۆم بژیم ..،
بۆیە لەگەڵ هەر ئازارێکی ئێوەدا ... ڕادەچەنیم .
من نەمدەویست بۆ خۆم بژیم ..،
بۆیە کە کازیوەی بەهار ..،
مژدەی خۆری بۆ دەهێنان ..!!،
پڕ بە هەستم پێدەکەنیم .
ژیان بۆ پێشەوەو ... پێشتر هەنگاو دەنێ
بیری کۆنە بەسەردەچێ ـ ،
دەزگای ڕەشی ئەهریمەنە رادەقەنێ .
کاروان دەروا بەرەو لوتکە ..!!،
بۆیە بۆ قۆناغی جێماو ..،
بۆ یادگار چەپکێ نێرگزی ئاڵ دەچنێ .

× × ×

کاتێ سەرچۆپیمان ستاند ..،
ویستمان تۆوی چۆپی کێشی دابچێنین ..،
لە مەیدانـا .
بۆیە کە سینگمان نا بە سینگی هەڵدێرا ..،
تا پەنجەرە داخراوەکان بکەینەوە ..،
بنیمان سێڵاوی برسیو زامدارەکان ..،
شەپۆل ئەدا بەدوامانا .
رەشبەڵەکی سەرمەستەکان ..!! ،
ناپسێتەوە .. تا لەسەر ئەستێرەی دەیجوور ..!! ،
تیشکێ هەڵدێ دەڵێن تیشکی ئازادانە .
زۆر هەرەسو سێڵاومان دی ..
گەلێك ئاوی سووری خوێناوی چاومان دی .
بە تارای سپی باوەڕمان شۆردمانەوە ..،
سەرلەنوێ ڕیشەی بنیاتمان ..،
لە زەوی‌یەکی نوێی بەیاردا ، نایەوە خاك .
تا بەربگرێ بۆ نەوەو هۆزو وڵاتی ..،
ئاوارەو ژێردەستی ناپاك .
دوبارە لەگەڵ بەهاردا ..،
چوزەرە دەردەکا گوڵمان ..
فشاری خوێن تاڤگە دەکا ..،
لە گۆلاوی گەرمی ... دڵمان .

× × ×

من نەمدەویست بۆ خۆم بژیم ٠٠ ،
پێستم دەستم – بیرم ٠٠ هەستم ٠٠،
بۆ مرۆڤ تەرخان کرد بۆیە ٠٠،
ئەمرۆ بۆ ژین بێ دەربەستم ٠
بۆ یەخەی چەوساوە گوڵو ٠٠،
بۆ زۆرداران وشەی پەستم ٠

× × ×

من نەمدەویست بۆ خۆم بژیم ٠٠ ،
بۆیە پرچی هۆندراوەی پەیمانم کردە گەردن ٠٠ !!
هەنگاوم نا بۆ سەر میحرابی بارەگای – ،
خۆشەویستی بەرەو مردن ٠
بە ئەسپایی ئەڵقەی پەنجەی یادگاریم کردە ملم
لە بەرچاوت بۆ مۆری پەیمانێ بەستم ٠
لە بەرپێتا کرنوش دەبەم ٠٠،
دەیلێسمەوە خاكو گڵم ٠
کاکۆڵی ئەسپی سەرکەشی هیوا ٠٠،
دەئاڵێنمە دەستم ٠٠ !!
لەناو هەوری حەوت ئاسمانا ٠٠،
پرچی زێرینی خۆر دەگرم ٠٠ !!
بۆ مەبەستم ٠٠ بۆ مەبەستم ٠

**مـارف عومەر گوڵ**

دەمێکە نەمدیوی

دەتوانم بێمە سەر ڕێگات و

هەوارێ هەڵبدەم

هەوارێ با ، بیبا نامەوێ

دەس بە دەستی عەشقەوە دەگرم و

لە هەستما کەژێکی نارمێ ی

هەر بۆیە ناترسم لە ڕێدا هەڵکەوم

درەختی باوەڕت لەبیرما ڕەنگینە

من کوردم ‥ کوردیش هەر ڕێبوارەو

ئارامگەو هەواری لە دڵیا سەنگینە .

دەمێکە نەمدیوی ،

« نەبینین ناتوانێ خوێنی

باوەڕو ئەوینمان بڕێژێ »

نەبینین ناتوانێ

کۆرپەڵەی ئارامو ئومێدمان بنێژێ

ڕێ دەگرم

ڕێگایە فرمێسكو هەناسەی

دڵدارو دڵبەرێ تەڕی کاو بیماڵێ

کەناری دەبێتە گوڵاڵە

ڕێگایە ئازاری میللەتێ هەڵگرێ

زامیشی هەر گوڵی ئاڵ ئاڵە .

زاهیر ئەحمەد سەوز

لەگەڵ دوا وەنەوزی زەردەپەڕدا ، هاتوچۆکەرەکان پێدزەیان لێ کردو لە کەلاوەکانیانا خۆیان مەلاس دا • خوڕەی چەمەکەو تروسکەی قوتیلەکانو ەەگوەڕی ناودێ ، خامۆشیو تاریکی ئەتارانو ژیانی ئەکرد بەو دەوروبەرەدا •

نەهەنگی ترس دەستی نابوە بینی گەمژەکانو هەناسەی لێ بڕیبوون • قوتیلە نەوتییەکانیش ، یەك بەدوای یەکا ، لە شێوەی دوا هەناسەی مۆمی سەر گۆڕی بیستراوی نەبینراوی ، موشایەخەکان وەنەوزیان ئەداو تاریكو نوتەکی شەویان بە باڵای کەلاوەکان ئەبڕی •

دایکی حەمەلاو بسکە سپییەکانی لە پەنا گوێیەوە ، ئاخنیە ژێر کرمەکەیو کفتو ماندو ڕوی کردە پیرەی مێردی •

ــ ئەمشەو شەوەکەی تۆفە •

حەمەلاو قسەکەی بە دایکی بڕی ، پێش ئەوەی پیرەی باوکی وەلام بداتەوە • کەلێنێکی کردە دەرگاکەو سەرنجێکی بەری ئاسمانی دا • بەپەلە سەری کێشایەوە ژورێو بەلای باوکیا وەرچەرخا ، سفتچن کەوتە قسە •

ـــ دەیان شەوی‌وا تۆفمان دیوە • گرنگ ئەوەیە نەگبەتیەکە یەخەمان نەگرێتەوە •

(ژیان)ی ژنی حەمەلاو لە گەنجینەکە بەدەم ژانبژاردنەوە گلۆلەی ئازاری کۆنو نوێی هەلکردەوە •

ـــ بۆچی هێشتا بەرۆکی بەرداوین ، تایەخەمان بگرێتەوە !!

پیرەی باوکی حەمەلاو سەری بەسەر سنگیا شۆڕ کردبۆوە ، بە بیستنی نەگبەتیەکە ، وەك کێچ راچلەکی ، سفتو سوێی ئازاری بزماتەی برینی کۆنی هاتەوە یاد • وەك هەوری بەهار گرماندی •

ـــ نازانم بۆ بە « نەگبەتی » ناوی ئەهێنن ؟!!

حەمەلاو لەنگەری چاوی لەسەر باوکی گیرسایەوە ، بە ترس‌و لەرزەوە •

ـــ بابە گیان نەگبەتە ، ڕوی کردبێتە هەر شوێنێك بەقوڕی گرتووە • ئەلێن شەوی ڕابوردوش لە دێکەی ئەودیو سەری هەلداوە •

پیرەتەلخی دەرونی بە دوا بنسکی زۆرە ملە ، سپی کردەوەو نەڕاندی •

ـــ بەهەلەدا چون • ئەوەی لە دێیەکەی ئەودیو بینراوە ، ئەوە نیە ئێوە تێی گەیشتوون •

پیره لەگەڵ ئەم قسانەشیدا ، هەندێ جار ، لەژێـر بـاری قـورسی دوودلیا ، زمانی ساتمەی ئەکردو هیواش ئەبۆوە •

حەمەلاو خۆی بۆ نەگیرا • بناوانی بیرو هۆشی هەڵبەست ، قوناوی بناوان پەنگاوی خواردەوەو لە زمانی‌یەوە سەری‌کرد •

ــ کەواتە تائێستا باوەڕت نیە کە بایەقوشە ؟!!

پیرەی باوکی ناوچەوانی گرژ کرد ، هەردوو لەپی دەستی گـرت بە کوانووەکەی بەردەمیاو پەنجەکانی یـەکالا کردەوە • گـێژەڵوکەی حیرس ، دڕکو داڵی بیابانی ڕامـاڵی‌و لـە چرچو لۆچی تەوێڵو هەوێڵو لاملیا ، ساتاری دا •

ــ نەخێر باوەڕم نیە ، بایەقوش بێت • ئەی بۆ هەڵۆ نەبێت ! •

حەمەلاو هەناسەیەکی هەڵکێشاو لەسەرمانا خۆی گرمۆڵە کرد •

ــ بابە گیان ناسنامەکەی بەدەنگیەوەیەو کرداریشی ڕوونو ئاشکرایـە لای هەموان • ئەگەر زوو سەری نەخۆین تەڕنێکی دیشمان پـێ ئەداتـەوە •

پیرە ئۆقرەی نەئەگرت • پەنگرکێشەکەی لە ژیلەمۆی ناو کوانووەکە وەردا ، بەدەم باوێشکەوە •

ــ من ئەڵێم ئەوەی لە گوندەکەی ئەودیو بینراوە هەڵۆیە • هەڵـۆش ترسی نیە ، بوونیشیان لە ناوچەکەدا مایەی شانازی‌یەو چی‌دیـش پێویستمان بە زێوانو داهۆڵ نابێت •

حەمەلاو پوازی بە قڵیشی باسەکەدا چەقاندو کەوتەوە قسە •

ــ بابە گیان قسەکانت لەسەر سەرم ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبیت • بـەڵام

داخەکەم نەگبەتی ئێمە لەوەدایە ، تائێستا هەندێکمان دەنگ‌و ڕەنگی هەڵۆو بایەقوش لێك جیا ناکاتەوە •

پیرە ویستی بێتە قسە •

دەنگی بایەقوشەکە بە قەفی کلاوڕۆژنەکەدا چۆڕاوگەی بەست‌و خەمناکی ڕۆژانی ڕەش‌و بێ‌باوەڕی کۆنی بە پیرە یەق‌کردەوە • حەمەلاو وەك منالێکی بزۆز پەلاماری باوکی دا ، لە خۆشیا گەشکە گرتی‌و لە ترسی نەگبەتیەکە ڕاما •

— گوێت لێیە • ئێستا دڵ نیا بویت کە بایەقوشە •

( ژیان )ی ژنی حەمەلاو لەپشت هەیوانەکە بەرە ژانی ئەژمارد • جاربەجارێك زریکەیەکی لێ هەڵئەستا • دایکی حەمەلاو هەردوو دەستی گرت بە لاشیپانی دەرگای گەنجینەکەوەو ڕوی‌کردە پیرەی مێردی •

— ئۆباڵی ئێمەو هەمو دانیشتوانی گوندەکە ، ئەکەوێتە ملی تۆ • بۆ خۆت ڕیشگاو کردووەو لە کەلی شەیتان نایەیتە خوارێ• بایەقوشەکە بەقەدەر ئەرژەنگێکی دێو ئەبێت‌و هەردوو چاوی لێ ئەنوقێنی • پر بە دەم ئەخوێنێ‌و هاوار ئەکات گوێی لێ ئەخەفێنی •

حەمەلاو سەری بەرزکردەوە ، بەلای چەپدا وەرچەرخا ، پێ‌بەندی زمانی پساند •

— بەخۆڕایی خۆمان هیلاك ئەکەین • خدری زیندە پێی ناسەلمێنێ ، ئەوەتەی خوا دروستی کردووە ، هەر ویستویەتی قسە قسەی خۆی بێت‌و باوەڕی بە کەس نەهێناوە ، تا دەستی بە ئاگرەکەدا چزاوە •

دایکی حەمەلاو سەری ڕەزامەندی بۆ قسەکەی حەمەلاو خوار کردەوە • پیرەی باوکیشی کەوتە والابێژی مێشکی گڕنالی گرنالی‌و گەنم‌گرد کەوتەوە قسە •

— تۆو دایکت ئارەزومەندی سەرکێشی ئەندێشەن‌و ئاسمی سارد ئەکوتن • من لەمێژە ژیان لەگەڵ ئەم چەشنە پەڕندانە ئەبەمە سەرو دەنگ‌و ڕەنگیشیان لەناخەوە ئەناسم •

حەمەلاو دەستە ئەژنۆ بە باوکیا هەڵیئەڕوانی • چرۆی ڕاستی وەك گوڵە ئەرخەوان ، بەسەر سنگی خاکی سەوزچنی ، دوا وەنەوزی زستان‌و لەسەر گردی گومان پشکوت •

حەمەلاو درێژەی بە قسەکانی دا •

— باوەڕت هەبێ دەنگی بایەقوشە • کار ئەنجامی ئەم نیشتنەوەیەی بەقڕمان ئەداو سەرەنگرێمان ئەکات •

پیرە سەرتاڵی بیری قرچۆکی ، لەسەر خەڕەکی دەخەزاری هەڵکردەوەو مۆڕەیەکی لە حەمەلاوی کوڕی کرد •

حەمەلاو بێچارە جڵەوی ناچاری بۆ قسەکانی باوکی شل‌کردو نقەی لە خۆی بڕی • پیرەش درێژ دادڕانە بواری کەسی نەئەدا •

— ئێوە ئەم بڕیارە لەبەر بوورە ئەدەن •

حەمەلاو قیت بۆوە • هەرچەندی کرد قینی گڕگرتوی بۆ خەفە نەکراو لێلایی بەری چاوی گرت •

— بابە گیان بۆ خۆت هەڵئەخەڵەتێنی‌و ئەم گۆتاوە ڕۆیەمان ئەکەیتە ئەستۆ • نەگبەتیەکەی ئەوساڵەش ئالایە ملمان ، تا دەستی بە ئاگرەکەدا نەچزان‌و ئەشکی پەشیمانیت بۆ نەڕشت ، باوەڕت نەهێنا •

حەمەلاو زامی دەرونی بە هەناسەیەکی سارد برژاندەوە ، هەنسك لەبەر بینیا قەتیس مابو ، بەسەرهاتەکانی کۆنی بندرو کرد • دوو لێوی ووشك‌بوی هەڵهێنایەوە •

ــ بیکە بە خاتری خوا ، ئەم پاووشکە ڕێبەرەو ڕێچکە بۆ ئەوانەی
دواوەی ئەشکێنێ ، برینی کۆن‌و تازەمان دێنێتەوە سوێ ٠

حەمەلاو چاوی بڕی‌یە عەردەکەو پەنـگی خـواردەوە ، شڵێوەی
قینی شۆڕاوگەی بەست‌و درێژەی بە قسەکانی دا ٠

( ژیان )ی ژنم بـەرەژان ئەیگـرێ‌و لەسەر کاسەیـە ٠ پڕچـەنەو
پرتەوازەی بێباوەڕی ، مەلۆتکەی ئاواتمان زیندە بەچاڵ ئـەکات ٠ تەنهـا
کشەیەك دووری ئەخاتەوە ٠

تەوژمی ئازاری سەر کاسەو ویردی ئایەتول‌کورسی دایکی حەمەلاو
تێکەڵ بە دەنگی بایەقوشەکە بو ٠ هات‌و هاواری باوکی حەمەلاوو دادو
فیغانی حەمەلاو تاڵی کپی‌و بێدەنگی پساند ٠

بـە دزە ــ دزە لە هەر چـوار لای گوندەوە بەدەنـگیانەوە هاتن ٠
دانیشتوانی گوند بەرمەچێڵی چەپەری تەیمانەکەیان یەکالا کردەوەو لـە
بەردەم بانیژەکەدا یەکانگیر بوون ٠

کوڵەبنەیەکی وڕگ ئاوساو هاتە قسە ٠

ــ واژە واژو هات‌و هاوارتان لەوبەری گوندەوە دەنگ ئەداتەوە ٠
ڕاستی باڵندەیەکی سرك بو لە بن‌دەستی پیرەوە فرتەی کـرد ٠
حەمەلاویش دەستبەرداری نەئەبو ، بە هەمو توانایەوە بەدوایـا
ملی ئەنا ٠ بەخڕبوونەوەی دانیشتوانی گوند ، باوکی حەمەلاو لە
خەڵوەتخانەی بێداریدا ئۆقرەی گرت ٠

پیرەی خەڵوەت‌نشین لە خەڵکەکە نزیك بۆوە ٠

ــ خەڵکینە گوێ بگرن ٠ بزانن ئەم دەنگە دەنگی هەڵۆیە یان نا ؟!!
دانیشتوانی گوند لە قوڕگی نەهەنگی ترسا گیریان‌خوارد ٠ سیاچارانە

ویستیان بته‌کنه‌وه • کشته‌کی ئه‌ژنۆیان خـاوبۆوه • حه‌مـه‌لاو بـه قوتیـله‌یه‌کی کـزی دوکه‌لاوی‌یـه‌وه ، په‌نـاو پاسـاری مێشکیـانی ئه‌پشـکنی • ترس لـه قولـه‌ی قافا گیـری خـواردو خۆی نه‌دا به‌ده‌سته‌وه ، له دڵیـانا چه‌که‌ره‌ی کردو له پلوسـکی بێده‌نـگیه‌وه چۆڕاوگه‌ی به‌ست • شه‌ڵته‌ی ئـازار شـه‌وی گـرت به‌کۆڵه‌وه‌و جه‌سته‌ی لاسـاره‌کانی هێنایـه له‌رزین‌و لاتریسکه‌یـان لێ به‌ست • گێژه‌ڵووکه‌ی بێچاره‌یی ده‌ریای ژیانی حه‌مه‌لاوی شله‌قاند •

(ـ له‌ترسا بێده‌نگن یا سه‌رما گرۆڵه‌ی کردون !!)

پیره‌ی ئاخر شه‌ڕ شه‌که‌ت‌و که‌یل خۆی دابوو به‌سه‌ر گۆچانه‌که‌یدا ، مێشکی کرمژنی له تێزابی بێباوه‌ڕی‌دا ئه‌تواند‌ه‌وه‌و ئازاره‌کانی ئه‌قلیـانده جۆگه‌ی بیرو هۆشی ئه‌وانه‌ی سه‌ری ڕه‌زامه‌ندیان بۆ ئه‌له‌قاند ، ڕوباری خاکه‌رۆکی تێکه‌ڵ به ده‌ریـای خۆسه‌ره‌کان ئه‌کردو په‌نجه‌ی دیشـکه‌می ئه‌نا به ڕوخساری مێمله تازه‌که‌دا •

پیره هه‌ردوو لێوی ته‌ته‌ڵه‌ی ئه‌کرد • لغاوی ده‌می ترازاند •

ـــ وه‌ڵلاهی وه‌بیللاهی وه‌ته‌للاهی هه‌ڵۆیـه • ئـه‌م هه‌تیـوه بـه زۆری زۆرداری ئه‌یه‌وێت بیکاته بایه‌قوش •

ده‌نگی بایه‌قوشه‌که نوزه‌ی له هه‌موان بڕی ، پیره‌ی شه‌یتان لغـاو کرد • کاتێ باوه‌خوون کرانه‌وه ، بایه‌قوشه‌که به‌ئاشکرا ئه‌یخوێنـدو په‌رده‌ی گوێی هه‌موانی ئه‌له‌رانده‌وه •

حه‌مه‌لاویش لـه بـه‌رده‌م به‌ربه‌ڕۆچـکه‌ی ڕاستی‌دا خـۆی یه‌کالا کرده‌وه • ده‌نگی لاوێکی په‌شـۆکاو ، مـلی هه‌مـوانی بـه‌لای خۆیـدا ڕاکێشا • پلووسکی زمانی بێپه‌روایانه چۆڕاوگه‌ی به‌ست •

— وەڵڵاهی باوکم حەمەلاو ڕاستئەکا، ئەو دەنگە دەنگی بایەقوشە، نەك هەڵۆ • ئەڵڵاهو مەحـافیز •

لەولاوە لاوێکی کورتەبنەی مڕو مۆچ وەڵامی دایەوە •

— باوکی حەمەلاو ڕاستئەکات • سا وەڵڵاهی هەڵۆیە •

حەمەلاو هێدی هێدی لە لاوە کورتەبنە مڕومۆچەکە نزیـك بۆوە • ڕوی دەمی تێکردو ڕازی قسەی هۆنیەوە •

— ڕاستی لە تونی بابا گیری نەخواردووەو لە ئاوی ئامونیش بزر نەبووە، باش گوێ بگرن • ڕاستیتان بۆ دەرئەکەوێ •

دایکی حەمەلاو لە گەنجینەکەوە وەدەرکەوت • دەستی ڕاستی دا بە پشتی حەمەلاوی کوڕیداو لە خەڵکەکە ڕاما •

باران هەڵیبرونگاندبو • کزەبای سەرما لە ئێسقـانو پێست کـاری ئەکرد ، زوربەیان هەڵئەلەرزینو چۆقەی دانیان ئەهات ، ڕازی قسەی داهـا •

— گوێتان لە دەنگی بایەقوشەکەیەو دڵنیاشن لێی ، بەڵام نـازانم بـۆ خۆتان کەڕ کردووەو چاوتان قوچاندوە •

حەمەلاو ڕوی بەلای ئەوانەدا وەرچەرخـان کە شەپـۆلی دوودڵـی ئەیهێنانە قسە ، گڕی لە پووشەڵانی باوەڕیان بەردا •

— ترسنۆکن • ئەگەر ترسنۆكو بەرژەوند پەرست نەبونایە ڕاستیتان ئەوتو لە کەسیش نەئەترسان •

( ـ ئەوەش بزانن • ڕاستی هەر ئاشکرا ئەبێت • چونکە ڕوی ڕاستی بە بێژنگ ناگیرێ ) •

لاوە کورتەبنە مڕومۆچەکە هێمنانە هاتەوە قسە •

ـــ وەڵڵاهی باوکم بایەقوشەو قسەکانی حەمەلاو ئاو لێڵ ناکات • لاوە پەشۆکاوەکە مۆڕەیەکی لێ کردو قسەکانی پێ بڕی •

ـــ ئێمە ئەم قسەیەی تۆ ناسەلمێنین • تۆزێك لەمەوبەر وتت باوکی حەمەلاو ڕاستئەکات ، کوێڕا هەڵگەڕایتەوە •؟!! تا بە چاو نەبینین نازانین کێ ڕاست ئەکات•

حەمەلاو سەری بەرزکردەوە ، هەردوو چاوی بڕی یە لاوە کورتەبنە مڕومۆچەکە •

ـــ وەختی خۆی بە چاو دیتان ، تا کارەساتەکەی بەسەرنەهێنان ئەنگوستی پەشیمانیتان نەگەست •

پیرە وەك نێچیرێکی ئەنگێوراو دەستێکی هێنا بە بەڵمە ڕیشیدا تاڵاوی ترشەلۆکی بێبڕوایی هەڵهێنایەوە ، گوڵێنی گومانی بە تۆپەوانەیەکی پەواو ئاخنیو بیرو هۆشی خەفە کرد ، سەرگلۆڵەی ڕابوردوی لەسەر تەونەکەی ئەهریمەن هەڵکردەوە •

ـــ درۆ ئەکەن • من بڕوام پتەوە کە هەڵۆیە • هەر یەکێکیش پڕکێشی بکاتو سوور بێ لەسەر ئەوەی بایەقوشە ، تاڵاو ئەکەم بە قوڕگیا •

حەمەلاو لە قسەکانی باوکی هەڵسڵەمییەوە • شەوقی قوتیلەکان نیشانەی سەدان پرسیاری بێوەڵامیان لەسەر ناوچەوانی پیرەو باوەڕ پێهێنراوەکانی ئەنەخشاند •

کاسەلیسێك هاتە قسە •

ــــ ئەم دەنگە ، دەنگی هەڵۆیەو نابێتە بایەقوش • تا دوێنێ لە ئاواییدا مناڵتان پێ ئەکردە خەوو چەپڵەی ڕەزامەندیتان بۆ ئەکوتاو پیاتانا هەڵئەدا •

لاوێکی جوانچاك هاتە قسەو هەستی جۆشخواردوی بە با دا •

ــــ بەدچارەیی ئێمە لەوەدا بو بەدوای ڕاستیدا نەئەگەڕاین •

حەمەلاو قسەکەی لە دەم قۆستەوەو تەواوی کرد •

ــــ ڕاستیش لە قەپرغـەی گومانـا سڕبوبـو • وەك مـار لە ڕۆژانـی وەیشومەدا پەپکەی خواردبو • کاسەلێسەکانیش ڕاستییان لەژێـر پەردەی بریقەداردا بێهۆش کردبو • ئەمڕۆش دێمەرۆکی بڕوا بە پەنگاوی ئازار ئاو ئەدرێو ڕاسـتی لەبن پـەردوی داڕوخـاوو سوتاوا چوزەرەی کردووەو خەریکە سەوز ئەبێت • لاوە قسەکانی تەواو کردو حەمەلاو بێدەنگ بو •

ــــ پیرە دەستخەڕۆتان ئـەکا • بە بەڵخـی نەهامەتی بـەری چاوتان دائەپۆشێو بە چەپۆکی ڕۆژگار داتانئەگرێتـەوە • لـە ئەنجامـدا لەژێر سێبەری دارێکی زرو وشكبودا حەشارتان ئەدا • گومـان ڕاستی پۆزبەند کردبو ، بە کۆڵانە لیتاوییەکانی شاری خامۆشـدا ماڵئاوا نانی فەقێی پێوە ئەکرد •

هەرزەکارێکی شلەپەتەی لاژگ ، جامانەکەی لـە سەرو مـلییەوە ئاڵاندبو ، دوو لێوی قەمتەرکراوی هەڵهێنایەوە •

ــــ ئێستا ئێمە چیمانداوە لەم باڵۆرەیە • هەڵۆیـە یـا بایەقـوش مـلی ئەشکا • بۆ نەچینەوە بەلای کلاّو کلاّوێنەکەی خۆمانەوە •

حەمەلاو تێی‌ڕاما ، سەری بەزەیی بۆ وەرچەرخاند . قوتیلەکەی دەستی لە سەرو گوێلاکی نزیك کردەوە . دوو چاوی پەڵماوی لەژێر جووتێ برۆی هەڵکڕوزاودا زەق‌ئەچۆوە . ڕەهێڵەی قین لە چاوی حەمەلاودا پەنگی خواردەوە ، بەهێواشی چرپاندی بەگوێی هەرزەکارەکەدا .

— نەگبەتی یەخەی گرتووین . بایەقوش بەسەر سەرمانەوە ئەخوێنێ . چارەسەرێکی خۆمان نەکەین تەڕو ووشك پێکەوە دائەمرکێتەوە . ئەوەش بزانە ئەی گێلە پیاو ، لە خۆشی‌و ناخۆشی‌دا برا بەشین .
ئافرەتێکی ڕەش‌پۆش چەرمەسەری ژیانی لە باوەش گرتبو . تاریکی شەو لە دامێنی ئەتکا . لە دەریاچەی مارانگازاندا گەوزی ئەداو توێشە بەرەی مەینەتی لە قەد بەستبو . لە دیمەنی بەسامی هەموو ڕامان . دوو لێوی شکۆفەی پشکوت .

— خەڵکینە بە قسەی پیرە دەست‌خەڕۆ نەبن بایەقوشەو بەسەر سەرتانەوەیە .

پیرە بە باڵای قەترانی‌دا هەڵچو . ڕوی‌کردە هەموان‌و زمانی خستە گەڕ .

— ئەم شەوەیە جێی باوەڕ نیەو درۆ ئەکات . قسەکانی بێ‌مەبەست نیەو ئاکامی جڵو بەرگەکەیەتی .

ئافرەتە ڕەش‌پۆشەکە ڕوی گەشی ئاشکرا کرد ، فەقیانەکەی لە مەچەکی‌یەوە ئاڵاند ، سەری بەزەیی لە پیرە ڕاوەشاند .

— پێویستم بە درۆ نیە . پسوڵەی پەڕینەوەی سەر پردی سیرات بەسەر سنگمەوەیە .

پیرەی چەکمەڕەق لە بازگـەی بیری کۆنیـا گیری خـوارد •
بەسەرهاتی کۆنی پشیلە شۆر کرد • بە بارستایی چیا بەرزەکەی پشتی
گوند ، ئازاری گرتـە کۆڵ • تەزویـەکی کوردە نامـوسی بە لەشیدا
هـات •

— ئێوەو مانان تۆوی دووبەرەکی‌و ترس‌و دوودڵیتـان لـەم گونـدەدا
چاند •

ئافرەتە ڕەش‌پۆشەکە سەرپۆشـەکەی لە ملی ڕاماڵی‌و لـە سەریەوە
ئاڵاند ، سەرکلافەی تاڵەکانی مێشکی هەڵکردەوەو کڵۆمی دەمی هەڵگرت•

— تۆوی دووبەرەکی‌و ترس لەسەر سنگی کەڕەواڵەکان چەکەرەی
کردو سەوز بو • ئێوەش بە کۆچەڵەی مێشك پووتەکان ئاوتاندا •
بە دیداری ئەم ئافرەتە ڕەش‌پۆشە پیرە سنگی وەك مووشەدەمە دەهات‌و
دەچو • ناوبۆشی مێشکی بە قەترانی ڕەش سواخ درا ، لەژێر لێوەوە
بە ورتە کەوتەوە قسە • وڕێنەی پێش مەرگی بەگوێی هەمواندا دا•
لاوێکی بالآبەرزی سـپی‌پۆش بە لایتێکی دەستەوە هەڵقولآو هەموانی
دەم‌کوت کرد •

— منیش ئەڵێم بایەقوشە • فریای خۆمان نەکەوین ماڵوێران ئەبین •
پیرە خەوە نوچکە دەیبردەوە ، دوا چۆڕی بیری گوشی •

( — ئەمانە بەمشەوە درەنگە چون خڕبوونەوە • ئـەڵێی مـوی
سمێڵی حەزرەتی سلێمان‌یان بۆ هەڵکڕوزاندوون ) •

پیرە دۆش داما ، خوێنی جگەری خۆی ئەخواردەوە • وەك شـێرە
بەفرینەی دوا تۆفی زستان ئەتوایەوەو لە بەردەم تیشکی ڕاستی‌دا خۆی
نەئەگرت • گەلحۆکانیش چاویان لێ نەئەتروکان‌و گوێ قولاغ وەستابون•

چاوەڕوانی بەڵگەیەکی نوێیان ئەکرد بۆ مۆرکردنی بەڵگەنامەی بایەقوشەکە ، کە هەڵۆیە • دەستیان نەئەکەوت •

پیرە شاوڵی بیرو هۆشی داهاویشت • پەناو پاساری مێشکی پشکنی بێسوود بو • ناچار بەرو بارگەی بیری لیناو هەودای دایە پێش ، تەوژمی ڕاستی ڕای چڵەکاند •

لاوە سپی پۆشەکە لایتەکەی دەستی گرتە پەڕندەکە ، لەگەڵ یەکەم کلافەی تیشك ، شاباڵی لە زەوی توند کرد ، دوودڵەکان لە دیمەنی بەسامی ڕاچڵەکین • ڕاستی گومانی زیندەبەچاڵ کرد • پرزە براوەکانیش پەنجەی ئەشهەدویان درێژ کرد • گومان لە بەردەم ڕاستیدا ، گیانلەبەرێکی دەستەمۆ بو ، ئەنگوست ختوکەی ئەدا • هەموان دەستەو نەزەر لە بەردەمیا ملکەچ ڕامان •

کۆلوی ژیانی پیرە ، بە کۆڵەوژی (ڕاستە بایەقوشە) لە تەنوری ڕۆژگاردا هەڵقرچاو گومەزی نیازیان هەرەسی هێناو پیرە ملی لارکردەوە•

فیغانی باوکەڕۆ ئاڵایە گەردنی قاقای خوا لێمان نەسێنێ (کوڕە)و بە دایكو باب گەورە بێ •

دایکی حەمەلاو فرمێسکێکی نامۆی بەسەر تەرمی پیرەدا ڕشت • کوڵی گریانی بە موشەدەمەی کەلەڕەقیی پیرە جۆشداو بە تۆپەوانەی باوەڕی حەمەلاوی کوڕی زاربینە کرد •

دوو هەنگاو کشایەوە بۆ دواوەو پاڵی دا بە کۆڵەکەی بەرهەیوانەکەوە • بە تیلەی چاو ، دوا خوا حافیزی لە لاشەی ساردو سڕ کرد •

ڕوی دەمی کردە چواردەوری •

— پێویستمان بە مامانێکی شارەزا هەیە • نـاوکی کورپـەکەمان بـۆ نابڕرێو لە دایکی جیا نابێتەوە •

لاوە کەیلەکە وەڵامی دایەوە •

— خێرا ڕاکەن بچن ( نەنە ئایش ) بێنن •

لاوە سپیپۆشەکە هاواری لێ هەستا •

— نەکەن ، کەڵکی پێوە نەماوەو هێزی تیا نیە • چاوەکانی کزبوون •

لەژێر نینۆکی پەنجەی هەڵقرچاویشیا ، هەزاران جرو جاتەوەر بەرو بارگەی خستووە •

چەقۆکەی بەرباخەڵیشی ژەنگی هەڵهێنـاوە • دور نیـە کورپـەکە تووشی دەردە کۆپان نەکات • لەگەڵ قسەکانیشـیدا لایتـەکەی دەسـتی لەسەر بایەقوشەکە نەئەگواستەوە •

حەمەلاو هەناسەیەکی هەڵکێشاو ئازاری پەنـگ‌خواردوی بـە بـا داو هاتە قسە •

— ژیانی کۆرپەکەو (ژیان) ، بەنـدە بە ملی بـایەقوشەکەوە • مـلی ئەم شوومە ببرن ، (ژیانو کورپەکە) ڕزگاریان ئەبێتو نـاوکەکەش بە هاسانی ئەبڕرێ •

لاوە سپیپۆشەکە دەستی برد بـۆ خەنجەرەکەی بەرپشتی ، لەگەڵ جریسکەی دەمی خەنجەرەکە ، قین لە چاویا وەك هەورە بروسکەی بەهار شریخەی دا ، بە دوو پەنجە سەری بایەقوشـەکەی بـەرز کـردەوە • دیمەنێکی ترسناك یەخەی گـرت • حەمـەلاو زیـاتر لـە بایەقوشـەکە نزیك بۆوە • پـارچە کاغەزێکی بچوك بـە قـاچی ڕاسـتی بـایەقوشەکەوە پێچرابو ، دەستی بردو هەڵیپچڕوکاند •

حەمەلاو هاواری کردە لاوە سپیپۆشەکە •

— خێراکە ، گزنـگ ملی بایەقوشەکەیە •

حەمەلاو پارچە کاغەزەکەی لە لەپی دەستیا گرمۆلە کرد • لاوە سپی پۆشەکەش بە چاوتروکاندنێك سەری بایەقوشەکەی لە مـلی کردەوە • برینو ئازاری دایکی سەرکاسـە ، بە دواهەناسەی بایەقوشـەکە هیـور بۆوە • لاوە ، دەمی خەنجەرەکەی بـە لاڕانی خاویـن کردەوەو دایـە دەست مامانەکە •

— ئەم خەنجەرە ناوکی کۆرپەکە ئەبڕێ •

لەگەڵ گزنكدا لاشەی پیرەو بایەقوشەکەو ویڵداشی کورپەکە بەخاك سپێردران • لە ئازارو خۆشیو گرێگۆڵدا ، هەودای پێوەندی خەڵکەکە بەدیئـەکرا •

شنەیەکی ئاوات هێن ، ئارەقـی نێوچـەوانی دایـکی سەرکاسـەو چۆڕاوگەی خوێنی ڕەشی ملی بایەقوشەکەی وشك‌کردەوە •• ئاواتـی نوێ ، چەکەرەی کردو ڕەگی لە ناخی زەوی چەقاند • هێزیشی بـە لەشی ساردو سڕی گێلو نەفامەکان ئەداو ماندوێتی شەوی ڕابـوردوشی ئەڕەواندەوە •

# سکاڵا

خورشیدە بابـان
پێشکەشە بە کوردستانی ئێران

دە شمشاڵ‌ژەن ئەی ئازیزم ،
مەوەستە با بێ دەنگی نەی ،
زۆر زویرە دڵی زیزم !
مەستم کە ، دەسا توخوا ، دەی ،
لە سەرچاوەی سروشتی پاك ،
پێم ببەخشە تۆ کاسەی مەی ،
دەروون تەواو بریندارە !
خەمەکانی بێ ژمارە !
چار نیە ،
دادی نەدەی ،
هەڵم‌گرە لە زەلکاوێ ،
بمگەیەنە چەشمەو ئاوێ ،
ئاوات بۆ کاتێ ئەخوازم ،
کە لە خەفەت دوور بم تاوی ،

ده شمشاڵژەن بە قوربانتم ،
لەتاو خەم دەستەو دامانتم ،
تەنیا تۆی کە چارم بکەی ،
دە لێدە با بێ دەنگی نەی ،
با بێ دەنگی کەیانی کەی ،
با بگات بۆنی رەزە بەی ،
چنار هەروەك منی هەژار ،
خۆی ڕاوەشێنێ لە هەوار ،
کوانێ شەماڵ ؟ کوانێ سروەی ؟
نالەی ستەم هەتاکو کەی ! ؟
من کە لەم سروشتە پاکەم ،
نەوەی ئەم خاکە خەمناکەم ،
لەگەڵ هۆزار ، لەگەڵ هۆرە ،
کام زام قووڵەو پڕ ناسۆرە !
کام شەو سەختە ، کام خەم زۆرە !
هەموویم نۆشی بە نۆرە !
منم هەڵگری نامەکەی ،
هەرگیز ساتێ نەموت ئۆخەی ،
دە لێدە نەی هێزم برام ،
هەر بە تەمای تیشکی هیوام ·

جەمـال نووری

گورگە پیرەی ناو ئەشکەوت
وا زمانی لە گۆ کەوت !
گەرچی ئەشلەرزی ئەژنۆی ..
هەر گورێکی دایە خۆی

— ئەی گەر نەشچێتە دەرێ ..
ئەبێ لە برسا بمرێ !

— بۆیە لارە .. لارەوە ...
ورد بۆی هاتە خوارەوە
نێچیریش بەدی بکا ...
مەگەر بە فێڵ ڕاوی کا
کە ئەڕۆشت بە ڕێگەوە
لە ژێری هەژگێکەوە

ژیشکێکی بەدی کرد
کە بۆ خۆی یاری ئەکرد

+ مام گورگ سەرنجی بزی ‥
هیوای ژیشکی ‥ دزی
چونکە هەر لە دوورەوە
بە دەنگی جەسوورەوە

ـ گوتی بە فەرمانی ‥ شا
ئەژین لە ئاسایشا
ئیتر بۆچی ئەی بێفەڕ
داناکەنی ‥ بەرگی شەڕ !

+ پاشام فەرمووی هەر ئێستە
پێی فڕێدەن ئەو پێستە

ـ بەڵام ژیشك لەسەرخۆ
گوتی گەورەم ئەگەر تۆ
ڕاستت ئەکرد لەپێشا
دانی خۆت هەڵئەکێشا
جا ئەوسا ترسو گومان ‥
ونئەبوو لە بەرچاومان

ـ ئەوساکە خوانەخواستە ‥‥
دڕۆش بێت ئەڵیم ڕاستە
گوتی لێم مەگرە ‥ وڕك
بوو بە کۆمەڵێك ‥ دڕك

دواییش پیاوانه گوتی ٠٠
وا پۆشیم بەرگی ئاشتی
ئاشتی وا بە ٠٠ بەر ئەبێ
کە ژیان مسۆگەر بێ

## بەستەی من

زەردەخەنەی سەر لێوم
شنەی ئازیزی کێوم
بەهاری سەوزی ژینم
ورشەی ئەستێرەی شینم
شەپۆلی نەرمی هیوام
تیشکی بەیانی ساوام
نازی خۆری دەم ئاسۆم
کۆتری سپیی بێکاسۆم
هاورێی مەلی سەربەستیم
فریشتەی تەندروستیم
پەپوولەی خۆزگەی دەشتم
وتەی جوانی زەردەشتم
من هەڵاڵەی ئاواتم
خوێنی دڵی وڵاتم

# دڵی موحەڕڕەم لە لێدان کەوت

لە ناوەڕاستی تەمووزی ڕابوردوودا ، دڵی نووسەرێکی بەهرەوەرو پێشکەوتخوازی کورد ، تێکۆشەرێکی ڕێگای ئازادیو دیموکراسیو مافی نەتەوەیی ، پێشەنگێك لە پێشەنگانی نووسینی چیرۆکی نوێی کوردی ٠٠ دڵی مامۆستا موحەڕڕەم موحەممەد ئەمین لە لێدان کەوت ٠

موحەڕڕەم لـە ڕیـزی پێشـەوەی ئەوانەوەیـە کە بـە نووسـینە ڕەنگینەکانیان ڕێگای دواڕوژیان بـۆ گەلەکەیـان ڕوشن کردوەتـەوەو ، هەمیشە بۆ ئەدەبێك هەوڵیانداوە کە خۆی بە مەسەلەی گەلەوە بەستێتەوە٠

موحـەڕڕەم محەمـەد ئەمیـن ، وەك چیرۆکنـووسی چـاك بـوو ، وەرگێڕێکی قابیلیش بوو ، نەك هەر لە مەیـدانی ئەدەبـدا ، بەڵـکو لـە مەیدانەکانی کەشدا ٠ ئەو لە پێشترینی ئەوانەوەیە کە هەوڵیانداوە زمانی کوردی بە فەلسەفە ئاشنا بکەنو کتێبی فەلسەفییان خستوەتە کتێبخانـەی کوردییەوە ٠ لە ماوەی ڕۆژنامەنووسییشـدا لـە دەزگـای هـاوکاری دەریخست کە ڕۆژنامەنووسێکی کارامەو بەبەهرەیە ٠

کۆستی ئەدەبی کورد بە کۆچی ناوادەی موحەڕڕەم موحەممەد ئەمین، زیانێکی لە بژاردن نەهاتوویە ٠ ئەگەر مایەیەکی سەبووریمان بێ هـەر ئەوەیە کە ناوەڕۆکی ژیانی لە بەرهەمی پێشکەوتخوازی ئەدەبی کوردیدا هەمیشە هەر بە زیندوویی ئەمێنێتەوە ٠

**« نووسەری کورد »**

# راپۆرتێك دەربارەی چالاكییەكانی
# لقی سلێمانی
# یەكێتیی نووسەرانی كورد

١ ـ یەكێتی نووسەرانی كورد ـ لقی سلێمانی یەكەم كۆڕی وەرزی ڕۆشنبیری پاری لە ڕۆژی ١٦/١١/١٩٧٩دا بەست • لەم كۆڕەدا كاك كەمال میراودەلی وتاری دەستەی بەڕیوەبەری خوێندەوەو پاشان پێنج شاعیری لاو شیعریان خوێندەوە كە ئەمانە بوون :

١ـ خەبات عارف ٢ـ حەمە سعید حسن ٣ـ عثمان شەیدا ٤ـ ناصر حفید ٥ـ جمال محمد اسماعیل •• كاك محمد فریق حسن كۆڕەكەی هەڵسووڕاند •

٢ ـ لە ٣٠/١١/١٩٧٩دا یەكێتی كوڕێكی بۆ چیرۆكو ڕەخنە بەست • كە كاك شیرزاد حەسەنو كاك حەمە كریم عارف چیرۆكیان تێدا خوێندەوەو مامۆستایان كەمال میراودەلیو فؤاد قەرەداخی ڕەخنەو لیكوڵینەوەیان دەربارەی چیرۆكەكان پیشكەش كرد •

كۆڕەكە لەلایەن مامۆستا سەلام مەنمیی‌یەوە بەڕێوەبردرا •

٣ ـ لە ٧/١٢/١٩٧٩دا مامۆستا شكور مستەفا باسێكی بەنرخی سەبارەت بە ڕۆمانەكانی یەشار كەمال پێشكەش كرد • كاك كمال ڕؤوف كۆڕەكەی هەڵسووڕاند •

٤ ـ بەبۆنەی ساڵی منداڵانەوە لقی سلێمانی چالاکییەکی بەربڵاوی بۆ خزمەتی نەوەی تازەمان نواند • لە ڕۆژی ١٥/١٢/١٩٧٩دا یەکێتی کۆڕێکی فراوانی بۆ ئەدەبی منداڵان پێکهێنا کە ئەم ئەدیبو شاعیرانە بەشداریان تێدا کرد : ١ـ ع•ع• شەونم ٢ـ تایەر ساڵح سەعید ٣ـ ئازاد عبدالواحد ٤ـ جەزا عەلی ئەمین ٥ـ دایکی سۆلاف ٦ـ سەلام مەنمی ٧ـ محمد رشید فتاح • شایانی باسە بەرهەمەکان لەلایەن منداڵان خۆیانەوە پێشکەش کرانو تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو •

٥ ـ هەروەها لە ڕۆژی ١٩/١٢/١٩٧٩دا کوڕێکی دیکەی فراوان بۆ ئەدەبی منداڵان پێکهێنرا • کە ئەم ئەدیبو نووسەرانە بەشداریان تێدا کرد : ١ـ جمال نووری ٢ـ عمر عبدالرحیم ٣ـ مصطفی صاڵح کریم ٤ـ محمد حەمە باقی ٥ـ کاکەی فەللاح ٦ـ حەمە رحیم رمضان • ٧ـ مامۆستا شکور مستەفا ٨ـ سەرکوڵ محمد امین •

جگە لەمانە لقی یەکێتیمان لە سەرلێدانی باخچەکانی ساوایانو دابەشکردنی دیاری بەسەر منداڵاندا بەشداری کرد • هەروەها کۆمەڵێك شاعیرو چیرۆکنووس بەشداریان لە خوێندنەوەی شیعرو چیرۆکدا کرد بۆ منداڵانی باخچەکانی ساوایان •

٦ـ یەکێتیمان لە ٣٠ـ٣١/١٢/١٩٧٩دا دیدارێکی گەورەی سەبارەت بە ئەدەبی منداڵان پێکهێنا ، کە لە ژمارەی پێشووی نووسەری کوردا، باسی کرابوو •

٧ ـ دوای وەستانێکی ناچاری لقەکەمان لە ڕۆژی ٧/٢/١٩٨٠دا دەستی بە چالاکی خۆی کردەوەو لەوڕۆژەدا لەلایەن کاك أحمد محمد ئابڵاخییەوە کۆڕێك بۆ لێکۆڵینەوەی باری ئێستای ڕەخنەی کوردی بەسترا • کاك حەمە سعید حسن کۆڕەکەی هەڵسووڕاند •

٨ ـ له رۆژی ١٩٨٠/٢/١٥ کاك حەمە سـعید حسن لیکۆڵینەوەیـەکی سەبارەت بە کتێبی [ئافرەت له چیرۆکی کوردیدا]ی مامۆستا صەباح غالب پێشکەش کرد • کاك فؤاد قەرەداخی کوڕەکەی هەڵسووڕاند•

٩ ـ له رۆژی ١٩٨٠/٢/٢٩دا لقی یەکیتیمان کۆڕێکی فراوانی بۆ یادی شاعیری مەزنی کورد عبدالله گۆران پێك هینا • مامۆستایان : محمد رسول هـاوار ، محمدی مەلا کریم ، کەمـال مـیراودەلی و ئومێد ئاشنا بەشداری یان تێدا کرد • محمـد فریـق حسـن کـوڕەکەی بەرێوەبرد • ئەوەی شایانی باسە کاك عەلی بۆسکانی لـەم کۆڕەدا ، ئامادەیی خۆی دەربڕی کە [ ٥٠٠٠ ] دینار بە قەرز بدا بە یەکیـتی بۆ چاپ کردنی دیوانی گۆران • ئەم کارە جێگەی سوپاسی یەکیتیمان و هەمو رۆشنبیرێکی دڵسۆزی کورد بوو •

لەدوای ئەم کۆڕە چالاکییەکانی کۆڕبەستنمـان وەسـتێندراو هیواداریـن بتوانین له بارو دۆخێکی رێك وپێکدا دەست بە بەسـتنی کۆڕەکانمان بکەینەوە •

١٠ـ یەکیتیمان هاوکاری لەگەڵ مەڵبەندی لاوانی هەڵەبجەدا کرد بـۆ بەستنی چەند کۆڕێك له هەڵەبجە بۆ شاعیرو ئەدیبەکانمان لەوانـە :

١ـ کۆڕێك بۆ مامۆستا محمد امین کاردۆخی •

٢ـ کۆڕێك بۆ چیرۆك نووسان : محمد فریـق حسن ، سـەلام مەنمی ، زاهیر ئەحمەد سەوز ، جەلال مەحموود •

٣ـ کوڕێك بۆ کاك محمد حەمە باقی •

٤ـ کوڕێك بۆ خوشکە خورشیدە بابان •

هەروەها لقی یەکێتیمان دوو کۆڕی دەربارەی شانۆ بۆ بەڕیوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی سازکرد کە برایان کاك أحمد سالارو کاك یاسین قادر بەرزنجی پێشکەشیان کردن •

١١ـ لقی یەکێتیمان بڕیاریدا گۆڕەکەی (گۆران)ی نەمر هەڵبەستێ‌و بۆ ئەم مەبەستە ئەندازیاری پسپۆڕ کاك جەمال بەکر قەساب تەکلیف کراو ئەم کارە ئێستا لە تەواوبوونەدایە •

١٢ـ لقی یەکێتیمان ئەم ژمارەیەی لە (نووسەری کورد) ئامادەکردو ئەرکی لەچاپدانی گرتە ئەستۆ • هیواداریین توانیبێتمان بەم‌کارە خزمەتێکی ئەدەبی کوردیمان بکەین‌و هومێدەواریین بتوانین بەرهەمی‌تریش بخەینە ژێر چاپ •

# وتاری دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

## سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد

## لە ئاهەنگی دەستپێکردنی دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردیدا

## (سەری ڕەش ٢٥ ـ ٢٧/٩/١٩٧٩)

**لەجێ‌هاتووی سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی ئۆتۆنۆمیی کوردستان!**
**جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانی ئۆتۆنۆمیی کوردستان !**
**ئەمینداره بەڕێزەکان !**
**میوانە بەڕیزەکان !**
**خوشکو برایانی هاوەڵی ئەم ڕێبازە شیرینە !**

هەموو ساڵێك‌و چەند ڕۆژێك تێپەڕ بوە • زەوی تاقە سووڕێکی‌تری داوەو لە گەشتی ناو سەهۆڵبەندانی زستان‌و گوڵزاری بەهارو بای سەمووومی هاوینەوە هاتوەتەوە خەزان‌و خۆی بۆ گەشتێکی‌تری دێرینە ئامادە کردوە • ئێمەش گەردێکی بچووکی سەر ئەو ئەستێرە ئینسان هەڵگرەین • وا چوار وەرزی‌ترمان بردەسەرو ، بە گیانێکی‌ترەوە بۆ مەبەسێکی‌تر کە سەرەتای وەرزی تازەمانە ، هاتینەوە نزیك ئەو شارە دێرینەیەی ، چوار خوداوەند بوونە نیشانەی‌و ، لە دەشتی بەرینیا ، لەوساوە ، هەر بەدەم تیری ئەسکەندەرو داراوە هەمیشە ئارمانجی تیری قەزا بووین • پار لە هەولێری کۆندا ، پەیمانمان تازە کردەوەو قەوارەی کارمان دامەزراندەوە • وا ئێستاش هاتووینەوە بن ئەو درەختەی بێشکەی

بۆ سەلاحەدین لێ دروست کراو خانزادی تێدا بە شۆخی‌و مەردی پەروەردە کرا • پاش بیست ساڵ ڕابووردن بەسەر یەکەم ڕاوێژی ( بە کوردی خوێندن )دا ، دەمانەوێ پەی بە ڕاوێژێکی‌تر ببەین • ڕابوردووی تۆمارێکی‌تری گەش تۆمار بکەین‌و ئەمڕۆی بنەخشێنین‌و ڕێی سبەینێی گەش‌و ڕووناك کەین •

بەهار بوو •• لە سلێمانی •• لەو هەموو مانا قووڵ‌و بەرینانەوە کە لە ناوی ئەو شارەوە هاتە ناو دێڕی هەڵبەستەوە ئیلهام وەرگیراو دەنگی زولاڵی شیعری کوردی لە دڵی جەماوەری خەڵکەوە هەڵقوڵی‌و درایەوە بەگوێی خەڵکی تێکۆشەری ئەو شارەدا • ئێستاش ، پاش شایی‌لۆغان‌و مەهرەجانی سەرکەوتووی شیعری کوردی ••• وا دیسان شایی‌یە ، شایی چمکێکی‌تری نرخداری وشەی کوردی‌یە •

فێرین کە لەناو تەما ڕووناکی ببینین •• لە ماتەمدا پێکەنین دروست بکەین •• ئەگەر لە چەند لاشەوە شایی بێ بە ڕیزە ، کە خەنەبەندانیش هەر خوێنی ئازیزە •• بەڵام وا ئێمە هەر سەرچۆپی بۆ هەڵپەڕکیی ڕاستەقینەی ئەمڕۆو دواڕۆژ دەگرین • کونجی ئەو پێکەنین‌و شادی‌یە دەدۆزینەوەو ڕووی تێدەکەین • لە شیعرەوە دێینە سەر چیرۆکی کوردی •

دەمێکە بەردی بناغە دانراوە •

دەمێکە بانگی بەرەو شارستانێتی ڕۆیشتنی کورد دراوە •

**تا خەڵکی نەبێژیتن کو ئەکراد**
**بێ مەعریفەتن ، بێ ئەسل‌و بنیاد**
**ئەنواعی میلەل خودان کتێبن**
**کرمانج تەنێ دە بێ حسێبن**

هەر « مەم‌و زین » خۆی بناغەو دیاری‌یەکی داستانی‌و چیرۆکیی کورد بوو بۆ ڕۆژهەڵات‌و جێ‌دانەری کورد بوو لە ڕیزی ئەو بابەت‌و تەرزەدا کەگەلانی ڕۆژهەڵاتی پێ ناسران • وێنەی ئەوە بوو کە کورد تەپ‌و تۆزی دواکەوتن‌و ڕێگەی دووری لە خۆی داماڵیوەو هاوار دەکات :

**کرمانج نە پڕ د بێ کەماڵن**
**ئەمما د یەتیم‌و بێ مەجاڵن**

گەڕدەلوولی ژیان دێت‌و ئەو بنیاد نراوە ڕادەماڵرێ‌و لە چاڵی نائومێدیدا دەنێژرێ • بەڵام هیممەتی مەردان ، هیممەتی ئینسان کێو لە بن دێنێ • بۆتانیش خرابوە ژێر پۆستاڵی ڕۆمەوەو سلێمانیش « گەمی‌یە ڕەنگ » بەسەر دەریای خوێنی شارەزووردا دەگەڕا • بەڵام لە تەمدا ڕووناکی بەدی کرایەوە ، هاواری خودان کتێبی بەرز بوەوە • لەژێر سایەی ڕەشی ئەو ڕۆمە شوومەدا کە « لە شەخسیش دەدەن زەرەر » ••، نموونەیەکی‌تری شارستانێتی بەرزبوەوە • نووسینی پەخشان‌و شێخ حسەینی قازی ، بە کوردی خوێندن‌و کاك ئەحمەدی شێخ‌و ، هاواری ڕاستەقینەی خەلیفەکەی کاك ئەحمەد بۆ ئەو دوو ڕابەرە :

**مەدینەی مولکی بابان (موخلیسا) ، یەعنی سلەیمانی**
**کە جێی دوو حەزرەتی‌وا بێ ، ئەبێ وەك کەعبەتوڵڵا بێ**

هەر لەو مەڵبەندەدا خامەی ڕەنگینی کوڕە بەگزادەیەکی جاف ، لە گەشتی گەرمیان‌و کوێستان دەگەڕێتەوەو لە شاردا دائەنیشێ‌و ، لە زۆر لە دیمەنەکانی شارستانێتی‌و تەجروبەی نووسینی گەلانەوە ، دەنگی یاخی‌بوون‌و ناڕەزاییی خۆی دەکات بە بناغەیەك بۆ مەسەلەی ویژدان ، بۆ ڕاستی دانان ، بۆ ئەو سەرەتا ڕیالیستی‌یە ڕەنگینەی چیرۆکی کوردی •

وا چەرخێك بەسەر دامەزراندنی پەخشانی کوردیدا ڕابووردوە •

ئەوسا ئەو گەلە « یەتیمو بێ‌مەجاڵە » لە خۆی کەسی بۆ پەیدا دەبێتو خۆی مەجاڵ بۆ خۆی دروست دەکاتو ، هەر تەواو لەجێشدایە بڵێین بە پێوەندی لەگەڵ برایی دێرینی کوردو عەرەبدا لە ئاوو هەوایەکدا کە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ دروستی کردوە ، لە شوێنێکدا کە بە ناوی قارەمانی ئەو گەشتی بڕاییەوە ناونراوە ، لە (سەلاحەدین) کۆڕی ڕاوێژ بۆ چیرۆکی کوردی دەگیرێت •

گەلێك شانازیمان بە شیعری کوردی‌یەوە کرد •• بە دەنگی گەلمان دانا •• وتمان شیعری کوردی هەر لە سەرەتاوە لە باوەشی میرو سوڵتاندا پەروەردە نەبوو • کە دێینە سەر شانازی بە چیرۆکەوە دەنگمان دلێرترە ، هاوارمان بلندترە ، شانازیمان لەجێ‌ترە •

چیرۆکی کوردی لە نیو سەدە پتری تەمەنی خۆیدا هەموو وێنەو ڕەنگێکی لە سروشتو ژیانو گەلو خاكو ئینسان وەرگرتووەو سەرلەنوێ نەخشەی ژیانی تازەی پێ نەخشاندوەتەوە • هەر ڕەنگە دەرەبەگی کورد باش بزانن چیمان بە زوڵمو زۆریان کردوە •• هەر ڕەنگە ڕژێمی بۆگەنو بیرۆکراتی پاشایەتی خۆی بزانێ چیمان بە پۆلیسو ئەشکەنجەی کرد •• چۆن خامەی چیرۆکنووسی کورد بوە پەردەی لە ڕووی هەموو مودیر بەگەکانی هەڵماڵیوەو ، تیری کاریگەر بوە لە دڵی ئەو ڕژێمەی داوە • هەروەك ئێمە خۆشمان دەزانین کە چۆن دەنگی فەللاحی کورد ، دەنگی کرێکارو هەژاری کورد ، دەنگی مافی ئەدەبی کورد ، دەنگی ڕێزی پتەوی نیشتمانیو برایی عەرەبو کورد بووین • خۆمان دەزانین کە چۆنمان نووسیوەو بۆ کێ دەنووسین •

قارەمانی چیرۆکی ئێمە هەژارو ڕووت بووە • کوڕی گەل بوەو ، خەباتی هەر بۆ ئەو گەلە نەبەزە بوو • چیروکی کوردیش پاکیی وشەی کوردیی پاراستوە •

بەڵێ •• سەرەتای چیرۆکی کوردی ، سەرەتایەکی پڕ شانو شکۆو بەرز بوو • بە سەد ڕەگ بە واقیعو خەڵکو زەویو گەلو مێژووەوە بەسترابوو • شانازی‌یە بۆ چیرۆکی کوردی کە هەر لە سەرەتاوە بەستراوە بە ئەدەبیاتێکەوە کە بۆ ژیانو ئاسوودەیی‌و بەختیاری دەجەنگێ • سەر بە ڕێبازێکی گەورەی ئەدەبیاتی جیهانە کە شەرەفی ئامانجداری‌و خەباتکاریی دراوەتێ •• سەر بە ڕیالیزمە •

ژیانو دیمەنی هەمەڕەنگی ، کۆمەڵو چەوتی‌و چینی زەروو سروشتی ، ئیبداعی گەل ( فۆلکلۆرە دەوڵەمەندە بایەخدارەکەی لە قاڵبی نووسراوی تازەدا ) ، مێژووی سەرفرازیی خەباتی نەتەوە ، خۆشەویستیی خاکی نیشتمان ، پایەبلندیی ژنی کورد ، ئەمانە هەموو لە چیرۆکی کوردیدا ڕەنگیان داوەتەوە • تەنانەت ئەو بۆچوونانەش کە ڕەخنەیان لێ دەگیرێ ، زوربەیان هەر سەر بە ژیانو ڕیالیزمن • ئەگەر هەندێك دیمەنی بریقەداری پووچی ئەدەبیاتی مۆدێرنیزمی بۆرژوازیی ئەورووپا ، بە ناوی تەکنیکەوە ، خۆی بهاوێتە ناو هەندێك بەرهەمی تازەمانەوە ، ئەوەش هەر کەفی سەر ئاوەو چیرۆکنووسی کورد پەیمانی خۆی لەگەڵ گەلدا ناشکێنێ‌و دڵنیاین کە وەك گەوهەرێکی بەنرخ لە بندا دەنیشێتەوە • هۆشیارانە خۆی دەبەستێتەوە بەم گەلو نیشتمانەوە • چونکە زانستو ژیان ئەوەی بۆ سەلماندووین کە سامانی نەتەوەیی ( تراث ) هەروەك شتێکی پیرۆزە ، سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئەدەبیاتی هەموو نەتەوەیەکیشە• نە زۆری پێوە دەنێین‌و نە بە پەرستن‌و لێ‌لانەدانی خۆمان دەخەینە چاڵی کۆنەپەرستی‌یەوە ، نە بەوەش کە ڕێزی لێ نەگرین‌و سوودی لێ نەبینین‌و بەرەوپێشی نەبەین ، خۆمان دەخەینە گێژاوی خنکێنەری کۆزمۆپۆلیتی‌یەتی‌یەوە •

لەبەرئەوە کە چیرۆکی کوردی نە بە بەردەوامیی تەنیا حیکایەتـی کوردی دەزانین‌و ، نە بە سنعەتێکی گوێزراوەو وەرگیراوی ئەورووپاییی دادەنێین ، بەڵکو چیرۆکـی تـازەی کـوردی هەموو سامانـی وتـراوو نووسراوی نەتەوەیی‌و تەکنیکی چیرۆکی گەلان بە ئیبداعەوە لەگەڵ هەموو دەستکەوتەکانی کان‌و تەجروبەی ژیاندا تێکەڵ دەکات‌و لە وێنەی دوێنـێ‌و ئەمڕۆ دیمەنی شۆڕشگێڕانەی دوارۆژ دروستدەکا •

یەکێتیی نووسەرانی کورد شانازی بەوەوە دەکات کە ئەمە بۆچوون‌و بناغەی فەلسەفیی لە چیرۆك گەیشتنی زۆربەی زۆری ئەندامانی بێت ، کە هەر ئەمـەش ئـەو یەکێتی‌یە بـە ڕەگێـکی‌تری بەتین ، بـە گەل‌و زەحمەتکێشان‌و خاکی نیشتمان‌و ڕێگەی ڕاستی خەبات‌و بەرچاو فراوانـی بینینی برایی عەرەب‌و کوردو نەتەوە کەمەکانەوە دەبەستێتەوەو بزووتنەوەی ئازادیخوازی نیشتمانیی کورد لەم ڕێبازەشەوە دەبەستێتـەوە بـە خەبـاتی گەلان‌و کاروانی ئینسانەوە •

ئەوەی کە هەمیشە دوا وتە بێ‌و لەم دەرفەتەدا دەبێ بووترێت ، هەر ئەو وشەی وەفاداری‌یەیە کە ڕەوشتی بەرزی گەل فێری کردووین •

وەفادارین بەرامبەر هەموو ئەوانەی بەردێکیان لەم تەلارە قەشەنگەدا داناوە کە ئێستا بۆ شکۆ پێدان‌و هەوڵی بەرەوپێش‌چوونی کۆبووینەتەوە •

کە سامانی نەتەوەییمان بە بناغە دانا ، سەرەتای وەفاداریشمان هـەر بۆ ئەو نەتەوە مەزنەیە کە ئەو سامانی فۆلکلۆرە بەرزەی بۆ خوڵقاندین •

سەرەتای وەفاداریمان بۆ ئەو ڕابەرە مەزنەیە کە بە داستان ، بابەتی چیرۆکیی هێنایە شیعری کوردی‌یەوە ، بۆ ئەحمەدی خانیی مەزنە ، بـۆ ئەوە ، بۆ فەقێی تەیرانە ، بۆ خانای قوبادی‌یە ، بۆ حارسی بتلیسی‌یە •

ناوی بەرز هێنان‌و وەفاداریمان بۆ دامەزرێنەری پەخشانی کوردی، بۆ شێخ حسەینی قازی‌یە •

هەر لەو سەرەتایەدا بە وەفاوە ناوی جەمیل سائیب دەبەین •• لە دڵدا مەدالیای زێڕینی نیشتمان پەروەری بۆ ئەحمەد موختار جاف‌و پیرەمێردو حوزنیی موکریانی‌و حەمەعەلی کوردی دروست دەکەین•• بە ڕێزو خۆشەویستی‌و وەفاداری‌یەوە بۆ یادی پیرۆزی مەحموود ئەحمەدو شێخ مارفی بەرزنجی دەوەستین • یادی چیرۆکنووسی جوانەمەرگ لەتیف حامید بەرزنجی دەکەینەوە • ئەگەر توانامان بێت پەیکەرەکەی دڵی هەموومان دەگوێزینەوە وڵاتی بۆتان‌و سلێمانی‌و موکریان‌و لەوێ پەیکەری ڕۆمان‌نووسی گەورەی کورد عەرەبی شەمۆ دادەنێین •

بۆ ئەوانەش کە ماون تەمەنی درێژیانمان ئاواتە ، هەر بە ڕێزی بەرزیی ڕابەریی ئەم هونەرەوە دەڕوانینە عەلائەدین سەججادی‌و بلەو شاکیر فەتتاح‌و حەسەنی قزڵجی •

دوا وتە : ئەمە یەك‌بینین‌و سازکردن‌و گیروگرفتە •• ئەوەش هەموو بەشێکە لە چیرۆکی پڕ لە ساتمەو لە سەرکەوتنی وشەی کوردی•• وا سەرکەوتین‌و یەکمان گرت • سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی هاتوون •• بۆ میوانانی بەڕێز •• بۆ شۆڕشی ١٧ی تەمووز •• بۆ ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوان کە لەگەڵ ئەودا ئەم یەکگرتنە ڕێکخراو ، بەشێك لە ئەرك کەوتە سەر ئەو •• ئەمجارەش دەنگتان بێ •• دەنگتان نەڕزێ •• چیرۆك‌نووسان •• ڕەخنەگران •• پارێزەرانی وشەی پاکی کوردی •• دڵسۆزانی گەل‌و وڵات ••

سەرفراز بن !

# البيان الختامي للملتقى الأول للقصة الكردية

## المنعقد في مصيف ( سەری رەش )

## من ٢٥ - ١٩٧٩/٩/٢٧

تحت شعار « من اجل قصة كردية ملتزمة وهادفة على طريق الثورة والتنمية وبناء الانسان الجديد « انعقـد في الفترة مـن ٢٥-١٩٧٩/٩/٢٧ بالتنسيق بين اتحاد الادباء الاكراد والامانة العامة للثقافة والشباب الملتقى الاول للقصة الكردية في مصيف ( سەری‌رەش ) بناحية صلاح‌الدين فـي محافظة اربيل ، وحضره اكثر من ستين قاصا وناقدا قصصيا كرديا مـن محافظات منطقة الحكم الذاتي لكردستان ومن سائر انحاء القطر ، كمـا حضره ضيوف يمثلون الهيئات الثقافية الكردية ، وشارك فيه عدد اخر من الضيوف من اعضاء الاتحاد وغيرهم •

وقد افتتح الملتقى بكلمة من الاستاذ عبدالغفار الصائغ الامين العـام للثقافة والشباب في منطقة الحكم الذاتي ، كما القيت فيه كلمة من قبـل الدكتور عزالدين مصطفى رسول رئيس اتحاد الادبـاء الاكراد واخـرى من قبل رئيس فرع الاتحاد في السليمانية الاستاذ مصطفى صالح كريم • وتليت برقية وجهت باسم الملتقين الى السيد رئيس الجمهورية المناضـل صدام حسين ، حيوا فيها سيادته واشادوا بالمنجـزات التى حققهـا الشعب الكردي في ظل ثورة السابع عشر من تموز ، كما عبروا فيها عن تايدهم

التام لكل الخطوات التى تتخذها قيادة الثورة والدولة لتعزيز الوحدة الوطنية وتحقيق المزيد من تلاحم القوى الخيرة لصالح سعادة الشعب وعلى طريق تعزيز النضال ضد الاستعمار والرجعية والصهيونية ، وعبروا فيها كذلك عن تطلعهم الى ان تشهد المرحلة المقبلة من حياة قطرنا ترسيخا اكثر للحكم الذاتى وتعميقا لمضامينه حتى تتحقق لشعبنا الكردي طموحاته القومية الكاملة ولاسيما في المجال الثقافي •

وقد القى في الايام الثلاثة للملتقى عدد من البحوث والدراسات الجادة عن ( البطل في قصص حسين عارف ) كنموذج للبطل في القصة الكردية ، و ( قصص الاطفال في الفولكلور الكردي ) و ( عرض ونقد بيبليوغرافيا القصة الكردية ) و ( المضامين السياسية والاجتماعية للقصة الكردية ) و ( اللغة في القصة الكردية ) و ( المرأة في القصة الكردية ) و ( اختيار الشخصية والتجديد في مضامين قصص السبعينيات) • كما تليت عدة قصص من نتاجات الاجيال المتعاقبة للقصة الكردية الحديثة ، وقصتان عربيتان لقاص كردي وتقييمات نقدية للقصص المقدمة •

× × ×

ان المشتركين في هذا الملتقى يثمنونه عاليا لما تمخض عنه من نتائج موفقة • فهو رغم كونه يعقد دونما سابق تجربة في هذا المضمار ، ورغم قصر الفترة التي جرى العمل فيها لاعداده ، ورغم العثرات التى اعترضت طريق انعقاده سواء من حيث قصر الفترة التي اتيحت فيها الفرصة لمقدمي البحوث لاعداد بحوثهم ، او من حيث النواحي الادارية والمالية ، فقد حقق نجاحا كبيرا واشترك المسهمون فيه بجد واهتمام في النقاش مما اغنى مضامين البحوث المقدمة • ولذلك فان الملتقى يعتبر بحق علامة مضيئة في طريق الادب الكردي عموما والقصة الكردية خصوصا ، ولاسيما في

مجال عقد اللقاءات والندوات الادبية في المستقبل لدراسة مختلف جوانب ادب شعبنا وسبل تطويره والسير به الى أمام على طريق الانسجام التام مع طموحات شعبنا الكردي ولاسيما في المضمار الثقافي ، جنبا الى جنب مع خلق الاشكال الابداعية والتعبيرية الحديثة ، للسير مع موكب التطور العالمي للفن القصصي .

ان البحوث والدراسات التي قدمت في الملتقى والنقاشات التي دارت فيه ، تسمح لنا بالقول بثقة ان طريق القصة الكردية سيظل في المستقبل ايضا ، كما كان في الماضي ، طريق السعي الدءوب لخلق الانسجام التام بين المضمون والشكل والتناغم الجدلي بين الاشادة بالجوانب المشرقة للماضي والنضال في سبيل تجاوز عثرات الحاضر وصولا الى الغد الاسعد لشعبنا ، مع ادخال كل اساليب التطوير والتحديث الفنية ، طريق السير على خط متواز مع مستوى التطور الحضاري والثقافي المتنامي لجماهيرنا التى يتوجه اليها القاصون بكتاباتهم مع المشاركة الخلاقة لرفع هذا المستوى .

ان على القصة الكردية ان تظل سباقة ، في اطار عدم المساس بالخصوصية الفنية للعمل الابداعي والحفاظ على الخط الفاصل بين العمل القصصي والمقالات التقريرية والصحفية ، في طريق تربية المواطن الكردي بروح النضال في سبيل تعزيز خصوصيته القومية في مختلف النواحي ، جنبا الى جنب مع التآخي الكفاحي مع الشعوب التي يشاركها العيش ، طريق تعزيز أخوة العرب والكرد وسائر الامم التى يعيش معها ، في وحدة متراصة في النضال ضد الاستعمار باشكاله القديمة والحديثة وضد الرجعية ومن اجل الديموقراطية والتقدم الاجتماعي .

ان الاخذ بيد الانسان الكردي نحو ولوج اجواء الحضارة الحديثة والاخذ بكل وسائل التقدم ، ضمن الحفاظ على الجوانب المشرقة من

الماضي والارتباط الحي معه ، وتوجيه هذا الانسان الى المثل العليا في الحياة من ايثار وتضحية ووفاء وعرفان جميل وحب ، ونحو الدمج بين متطلبات الفرد ومتطلبات المجتمع ، في سبيل بناء الحياة الجديدة ، ينبغي ان يكون ، كما كان دوما ، منار الطريق للقاص الكردي • ان النضال في سبيل تطهير الفكر الكردي من ادران الرجعية والخرافات والتخلف ، من بقايا الموقف الاقطاعي المتخلف تجاه المرأة ، ومن اللامبالاة من العمل والايثار في خدمة المجموع يجب ان يظل موضوعا اساسيا من مواضيع القصة الكردية •

اننا في الوقت الذي نعود فنؤكد على ان للعمل الفني خصوصيته الابداعية التي ينبغي ان تظل دوما بمنأى عن التلاعب بها تحت اي ستار كان ، نؤكد كذلك على ان العمل الادبي ينبغي ان يكون كذلك بمنأى عن ان يصبح وسيلة للتعبير عن هروبية المتهربين من تحمل اعباء الحياة ، الذين لايكتفون بأنهم آثروا الهزيمة لانفسهم ، فيعملون حثيثا من أجل تسميم أفكار الغير كذلك بمثلهم ومواقفهم التي يرفضها شعبنا ويرفضها كذلك منطق الحياة •

اننا نرفض ان يكون ادبنا القصصي وسيلة لبث افكار الابتعاد عن الحياة وزخم موكبها ، افكار اللامبالاة تجاه الشعب والآمه وآماله • اننا نعلنها بوضوح: ينبغي ان يظل أدبنا بعيدا عن ان يتخذ حقل تجارب للقيم الاستعمارية والرجعية ، والبعيدة عن طموحات شعبنا وحاجاته ومثله ، عن ان يكون معبرا لافكار السفسطة والدجل والتقوقع في الذات والارتماء في أحضان الكسل والسلبية تجاه العملية الكبرى التي يشارك فيها شعبنا بقسطه ، عملية تصفية الاستعمار والاستغلال وتمكين الشعوب صغيرها وكبيرها من نيل حقها في تقرير مصيرها بنفسها ، هذه العملية المجيدة التي تشكل نغم الحياة الدفاقة في ارجاء المعمورة في عصرنا هذا •

ان الملتقين يدعون كتاب القصة الاكراد الى استيعاب المدارس الفنية

في القصة ، اينما ظهرت وحيثما ترعرعت ، والى الاستفادة منها بوعي وادخال اشكالها الملائمة على القصة الكردية لتخليصها من بقايا التقريرية والخطابية ولاشباعها بخصوصيتها الفنية بصدق ، وينبغي ان تؤخذ بعين الاعتبار في هذا المضمار حاجات شعبنا بمختلف قطاعاته ومستواه الحضاري والثقافي •

ان الملتقى الاول للقصة الكردية يدعو الاجهزة المختلفة للدولة والمعنية بشؤون النشر الى ان تنفتح اكثر فاكثر على كتاب القصة الاكراد من حيث اتاحة الفرصة لنشر مؤلفاتهم على نطاق القطر ولترجمتها الى العربية وما يمكن من لغات العالم الحية لتحقيق المزيد من التفاهم والتلاحم بينها •

ونحن ندعو الى العمل لاصدار مجلة كردية خاصة بالقصة والدراسات القصصية على ان ينشر فيها كذلك القصص المترجمة عن الادب العالمي • كما ندعو الى اصدار مجاميع سنويا من القصص الكردية باللغة العربية والى ترجمة مجاميع من القصص العربية الى الكردية في كل سنة ، فذلك مايتطلبه التفاعل الثقافي بين شعبينا الذين يجتمعان على صعيد الالام والاماني المشتركة •

ان المشتركين في اللقاء يقدرون عالى التقدير الاجراءات البناءة الاخيرة التي اتخذتها قيادة الثورة في منطقة كردستان من الغاء أحكام الاعدام واطلاق سراح المسجونين والمعتقلين والموقوفين واتاحة الفرصة للمواطنين البارزانيين للعودة الى كردستان وهم يعبرون عن ثقتهم بان المزيد من الاجراءات الهادفة الى اغناء مضامين الحكم الذاتي وتطبيقه بصورة حية وخلاقة والى تعميق الحقوق القومية وتوسيع الحقوق الثقافية لشعبنا الكردي وفتح مجالات ارحب امام شعبنا للاستفادة من هذه الحقوق حتى تشمل مختلف قطاعات المثقفين الاكراد ، سيعود بالخير العميم على تلاحم الصفوف الوطنية وتعميق اسس الاخوة العربية ـ الكردية •

× × ×

لقد نظر شعبنا الكردي في العراق الى الثورة الايرانية التي دكت اسس الحكم الرجعي الاستعمارى الشاهنشاهي الوالغ في دماء خيرة ابناء الشعوب الايرانية ، بعيون ملؤها الامل في ان تفتح صفحة جديدة بوجه هذه الشعوب ، صفحة تكون سطورها التآخي الوطني في ظل تمتعها جميعا بحقوقها القومية ، الا ان الفأل سرعان ما خاب باعمال البطش والتنكيل التي قام ويقوم بها حرس الخميني في انحاء كردستان الايرانية وفي عربستان كذلك •

اننا انطلاقا من حرصنا على ان تؤتي الثورة الايرانية ثمارها اليانعة لكل الشعوب الايرانية ، وعلى تضامننا الاخوى مع شعبنا الكردي في ايران ، نستنكر هذه السياسة الهمجية وندعو الى وقف اعمال البطش والتنكيل المتنوعة فورا ، والى فتح صفحة الحوار بين النظام وممثلي شعبنا الكردي في ايران وممثلي سائر الشعوب الايرانية وصولا الى ارساء دعائم الثورة هناك على أسس الديمقراطية والتآخي الوطني والحقوق القومية لكل الشعوب الايرانية •

ويغتنم الملتقون هذه الفرصة ليعبروا مرة اخرى عن تضامنهم المخلص مع المقاومة الفلسطينية الظافرة والشعب الفلسطيني المكافح ، في نضالهما من أجل ان يستعيد هذا الشعب حقه في السيادة على ارض وطنه باقامة دولته الديموقراطية فيها • اننا نعبر عن رفضنا لسياسة الاستسلام ، سياسة كامب ديفيد واللقاء الساداتي الصهيوني ، سياسة المفاوضات تحت المظلة الامريكية من اجل ما يسمى بالحكم الذاتي • كما نعبر عن تضامننا مع الشعب اللبناني في نضاله من اجل الاستقرار ووحدة اراضيه وقطع دابر تدخل الاستعمار والصهيونية وعملائهما في شؤون هذا البلد المعذب •

هذا ، والى الملتقى في ملتقى جديد ••

## وزارة الثقافة والاعلام

**صـــدر ..**

من سلسلة ديوان الشعر العربي الحديث

**« سورة الحب » ..**

للشاعر خالد علي مصطفى

قصيدة طويلة للشاعر كتبت في مخفر حدودي عام ١٩٧٨ .

**توزيـع**

**الدار الوطنية للتوزيع والاعلان / بغداد**

بۆئەوەی یادی یەکێتیی نووسەرانی کورد
هەمیشە لە دڵو بیرتدا بژی ،
ئەم بەرهەمانەی بکڕە :

(١) دیوانی گۆران ·
(٢) داغستانی من ·
(٣) هەر چوار بەرگەکەی گۆڤاری
« نووسەری کورد » ·
(٤) پەیڤ
(٥) نووسەری نوێ ·

بەرهەمەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد
بەرهەمی ئەدەبیێکن خۆی بە
مەسەلەی گەلو نیشتمانو
پێشکەوتنخوازییەوە بەستوەتەوە ·

چاپخانەی «الحوادث»
بەغدا ـ ١٩٨٠